

# زمان و ئەدەبی کوردی

## بۆ پۆلی دوانزەی
## زانستی و وێژەیی

"ڕێزمان ، ئەدەب ، ڕەوانبێژی"

ئامادەکردنی : م.تاهیر مەحمود کاکە حەمە

ئامادەیی ڕوشدی عەلی شەریف

2015-2016

# شێوازی کار

## یەکەم / شێوازی ڕاگەیاندن

شێوازی ڕاگەیاندن : ئەو ڕێژەیەی کارە کە ڕاستەوخۆ بۆ خەبەردان لە کارو حاڵی کەسێك بەکاردەهێنرێت .

شێوازی ڕاگەیاندن ئەم شێوازانەی هەیە :

**1- ڕێژەی ڕابردووی نزیك :**

ئەم ڕێژەیە بەلابردنی (ن) ی چاوگ دروست دەبێت :

چاوگ - ن = ڕابردووی نزیك ( قەدی کار)

خوێندن - ن = خوێند ، [ ئارام وانەکەی خوێند ]

| نمونە بۆ کاری تێپەڕ ( ئەرێ و نەرێ ، بکەر نادیار ) | نمونە بۆ کاری تێنەپەڕ ( ئەریٚ و نەرێ ) |
|---|---|
| سادە / بەخشی ، نەبەخشی ، نەبەخشرا | کەوت ، نەکەوت |
| دارِژاو / هەڵبژارد ، هەڵنەبژارد ، هەڵنەبژێررا | ڕاکشا ، ڕانەکشا |
| بردنەوە / بردەوە ، نەبردەوە ، نەبرایەوە | چووەوە ، نەچووەوە |
| لێکدراو / دواخست ، دوانەخست ، دوانەخرا | سەرکەوت ، سەرنەکەوت |

**2- ڕێژەی ڕابردووی تەواو :**

ئەم ڕیژەیە / لە ڕابردووی نزیك + نیشانەی ( وە ، ووە ) دروست دەبێت

| نمونە بۆکاری تێپەڕ ( ئەرێ و نەرێ ،بکەرنادیار ) | نمونە بۆکاری تێنەپەڕ ( ئەریٚ و نەرێ ) |
|---|---|
| سادە / هێناوە ، نەهێناوە ، نەهێنراوە | کشاوە ، نەکشاوە |
| دارِژاو / ڕاگرتووە ، ڕانەگرتووە ، ڕانەگیراوە | هەڵچووە ، هەڵنەچووە |
| نووسینەوە / نوسیوەتەوە ، نەنووسیوەتەوە ، نەنوسراوەتەوە | خولاوەتەوە ، نەخولاوەتەوە |
| لێکدراو / تۆمارکردووە ، تۆمارنەکردووە ، تۆمارنەکراوە | دەربازبووە ، دەربازنەبووە |

تێبینی **1** ៖ ئەگەر کاری ڕابردووی نزیك کۆتایی بە پیتی (ا،ی،وو) هات ئەوا نیشانەی (وە) بەکاردێت وەکو ៖کێڵاوە،بڕیوە، درووە، بەڵام ئەگەر کۆتایی بە پیتی (د،ت) هات ئەوا نیشانەی (ووە) بەکاردێت وەکو ៖ نوستووە ، خواردووە

تێبینی **2** ៖ لە ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیانندندا ، ئەگەر کاری ڕابردووی نزیك کۆتایی بە پاشگری (ەوە) هاتبوو ، ئەوا ناوبەندی (ت) دەخرێتە نێوان نیشانەی ڕابردووی تەواو و پاشگرەکەوە وەکو ៖

دۆزینەوە = دۆزی + وە +ت+ەوە = دۆزیوەتەوە =========== پارەکەم دۆزیوەتەوە ( ڕابردووی تەواوی ڕگەیاندن )

پارەکەم دۆزییەوە ( ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن )

تێبینی **3** ៖ لە شێوازی کرمانجی ژووروودا لە جیاتی نیشانەی (وە-ووە) نیشانەی (یە) لە ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن بەکاردێت

وەك ៖ هاتووە = هاتییە ، چاندووە = چاندییە

**3- ڕێژەی ڕابردووی بەردەوام** ៖ بەم یاسایە دروست دەبێت ៖

نیشانەی (دە) + ڕابردووی نزیك ⟵ دە + خوێند = دەخوێند

| نمونە بۆ کاری تێپەڕ ( ئەرێ و نەرێ ، بکەرنادیار ) | نمونە بۆ کاری تێنەپەڕ ( ئەرێ و نەرێ ) |
|---|---|
| سادە / دەنووسی ، نەدەنووسی ، نەدەنووسرا | دەنووست ، نەدەنووست |
| دارِژاو / هەڵدەواسی ، هەڵنەدەواسی ، هەڵنەدەواسرا | دادەبەزی ، دانەدەبەزی |
| بردنەوە / دەبردەوە ، نەدەبردەوە ، نەدەبرایەوە | هاتنەوە / دەهاتەوە ، نەدەهاتەوە |
| لێکدراو / نمایش دەکرد ،نمایش نەدەکرد ،نمایش نەدەکرا | ئاوارەدەبوو ، ئاوارەنەدەبوو |

کەمن هاتم ، بڕوا دەهات بۆ قوتابخانە ؞

تێبینی ៖ لە شێوەزاری کرمانجی ژووروودا لە جیاتی نیشانەی (دە) نیشانەی (د) بەکاردێت وەك ៖

خارن ⟵ خار ⟵ دخار ، خاستن ⟵ خاست ⟵ دخاست

**4- ڕێژەی ڕابردووی دوور** : بەم یاسایە دروست دەبێت :

ڕابردووی نزیك + نیشانەی (بوو)

| نمونەبۆ کاری تێپەڕ (ئەرێ و نەرێ ، بکەرنادیار) | نمونە بۆکاری تێنەپەڕ (ئەرێ و نەرێ) |
|---|---|
| سادە / خوێندبوو ، نەخوێندبوو، نەخوێنرابوو | گۆڕابوو ، نەگۆڕابوو |
| دارڕژاو / ڕاخستبوو ، ڕانەخستبوو ، ڕانەخرابوو | دانیشتبوو ، دانەنیشتبوو |
| هێنانەوە / هێنابووەوە ، نەهێنابووەوە، نەهێنرابووەوە | کەوتنەوە / کەوتبووەوە ، نەکەوتبووەوە |
| لێکدراو / ئاشکراکردبوو ، ئاشکرانەکردبوو ، ئاشکرانەکرابوو | نقووم بووبوو ، نقوم نەبوو بوو |

وەك : میوانەکەمان دانەنیشتبوو .

**5- ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن** : بەم یاسایە دروست دەبێت :

نیشانەی (دە) + ڕەگی کار + جێناوی کەسی لکاو (م- ین ،یت- ن ،ات ،ێت- ن)

| نمونە بۆکاری ڕانەبردووی تێپەڕ (ئەرێ و نەرێ) | نمونە بۆکاری تێنەپەڕ (ئەرێ و نەرێ ) |
|---|---|
| سادە / دەنێرم ، نانێرم | دەڕۆم ، ناڕۆم |
| دارڕژاو / دەگۆڕمەوە ، ناگۆڕمەوە | دەپەڕمەوە ، ناپەڕمەوە |
| هەڵبژاردن / هەڵدەبژێرم ، هەڵنابژێرم | دادەنیشم ، دانانیشم |
| لێکدراو / دروست دەکەم ، دروست ناکەم | پێش دەکەوم ، پێش ناکەوم |

وەك : ئەرکەکانم بە باشی جێبەجێدەکەم

تێبینی **1** : جێناوی لکاوی (ات) بۆ کەسی سێیەمی تاك کاتێ بەکاردێت ئەگەر ڕەگی کارەکە بە پیتی بزوێنی (ە،ۆ) کۆتایی هات وەکو : <u>دەڕوات</u> ، <u>دەبات</u> ، بەڵام ئەگەر ڕەگی کارەکە کۆتایی بە پیتی بزوێنی (ە،ۆ) نەهاتبوو ئەوا جێناوی (ێت) بەکاردێت وەکو : <u>دەنوێت</u> ، <u>دەرژێت</u> .

**تێبینی 2 : ئێمە وتمان شێوازی ڕانەبردوو جێناوە لکاوەکانی (م – ین ، یت – ن ، ات ، ێت – ن ) وەردەگرێ بەڵام چاوگی (ویستن)**

**بمانەوێ شێوازی ڕانەبردووی لێدروست بکەین لەم یاسایە لادەدات ، کۆمەڵە جێناوی ( م – مان ، ت – تان ، ی – یان)وەردەگرێت ،**

**کەدەچنە نێوان نیشانە و ڕەگەکەوە . وەکو : دەمەوێ = دەمانەوێ ، دەتەوێ – دەتانەوێ ، دەیەوێ – دەیانەوێ**

**تێبینی 3 : هەموو ڕێژەکانی ڕابردووی ڕاگەیاندن بە بکەردیار و بکەرنادیارەوە بە ئامرازی (نە) نەرێ دەکرێت وەکو :**

**نووسی ⟵ نەنووسی ، نە نووسیوە ، نەدەنووسی، نەنووسیبوو (بکەر دیار)**

**نووسی ⟵ نەنووسرا ، نەنووسراوە ، نەدەنووسرا ، نەنووسرابوو (بکەر نادیار)**

**تێبینی 4 : لەهەندێ ناوچەی هەرێمی کوردستاندا لە جیاتی نیشانەی (دە) نیشانەی (ئە) بەکاردێت وەکو :**

**دەخوێنم ⟵ ئەخوێنم**

**تێبینی 5 : لە شێوازی کرمانجی ژووروودا نیشانەی (دە) دەبێت بە (د) بۆ کاتی ئێستا وە دەبێت بە (دێ) بۆ کاتی داهاتوو وەکو :**

**دەچم ⟵ دچم ⟵ دێ چم**

**تێبینی 6 : ڕێژەی ڕانەبردووی ڕاگەیاندن بە ئامرازی (نا) نەرێ دەکرێت و شوێنی نیشانەی (دە) دەگرێتەوە وەکو :**

**دەڕۆمەوە ⟵ ناڕۆمەوە**

**تێبینی 7 : کاری ناتەواو بۆ کاتی ئێستا (ە) و داهاتوو و ڕابردوو شێوازی ڕاگەیاندنە وەك : یەکی ئایار جەژنی کرێکارانە . وڵاتی من**

**کوردستانە ، ئارام ئەندازیار بوو ، ئارۆ دەبێتە نوێنەرمان .**

**پ1/لە ڕستەی ( کتێبەکەت لەسەر مێزەکە داناوە ) 1= کوا بکەری ڕستەکە ؟ بۆچی لەو شوێنەدایە ؟**

**2= کارەکە لە چی ڕێژەیەکدایە ؟ 3= ئەگەر وشەی (کتێبەکە) لە ڕستەکە لابەریت ئەوا (ت) دەچێتە کوێ؟**

**وەڵام / 1= (ت) بکەری ڕستەکەیە چونکە بەرکار باسکراوە . 2= کارەکە لە ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندایە.**

**3= (ت) دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکە چونکە داڕێژراوە بە پێشگر و دەبێ بە (داتناوە).**

## دووەم / شێوازی دانانی

شێوازی دانانی : ئەو ڕێژەیەی کارە کە ڕاستەوخۆ ئەنجامی ئەو هەواڵەی دەداتە پاڵ کەسێك یان شتێك نایدات بەدەستەوە ، بەڵکو لەشێوەی 1-گومان ، 2- ئاوات ، 3- ئارەزوو و مەبەست ، 4- دوعا و پاڕانەوەدا واتاکەی دەردەکەوێت .

1- أ : ڕەنگە بەیەکەم دەربچم .  ب- لەوانەیە خەڵاتەکە وەربگرم .  2- پێویستە سەربکەوم.

3- دەبێت دەوڵەتی کوردی ڕابگەیەنین .  4- خوایە نیشتیمان ئاوا کەیت.

شێوازی دانانی ئەم ڕێژانەی هەیە :

1- ڕێژەی ڕابردووی نزیکی دانانی  2- ڕێژەی ڕابردووی تەواوی دانانی  3- ڕێژەی ڕابردووی دووری دانانی  4- ڕێژەی ڕانەبردووی دانانی

### 1- ڕێژەی ڕابردووی نزیکی دانانی :

ڕێژەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن + نیشانەی (با)

| نمونە بۆکاری تێپەڕ (ئەری و نەری ، بکەرنادیار) | نمونە بۆ کاری تێنەپەڕ ( ئەری و نەری ) |
|---|---|
| سادە / گرتبا ، نەگرتبا ، نەگیرابا | هاتبا ، نەهاتبا |
| دارِژاو / هەڵکەندبا ، هەڵنەکەندبا، هەڵنەکەندرابا | ڕاکشابا ، ڕانەکشابا |
| گرتبایەوە ، نەگرتبایەوە ، نەگیرابایەوە | کەوتبایەوە ، نەکەوتبایەوە |
| لێکدراو / سەرخستبا ، سەرنەخستبا ، سەرنەخرابا | دواکەوتبا ، دوانەکەوتبا |

وەکو : بریا کەوەکەت گرتبا .

2= ڕێژەی ڕابردووی تەواوی دانانی :

ڕێژەی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندن + نیشانەی (بێت)

| نمونە بۆ کاری تێپەڕ (ئەرێ و نەرێ ، بکەرنادیار ) | نمونە بۆ کاری تێنەپەڕ (ئەرێ و نەرێ) |
|---|---|
| سادە / کێلابێت ، نەکێلابێت ، نەکێلرابێت | گۆڕابێت ، نەگۆڕابێت |
| دارِژاو / دەرکردبێت ، دەرنەکردبێت ، دەرنەکرابێت | هەڵخلیسکابێت ، هەڵنەخلیسکابێت |
| کردبێتەوە ، نەکردبێتەوە ، نەکرابێتەوە | سوڕابێتەوە ، نەسوڕابێتەوە |
| لێکدارو / ڕێك خستبێت ، ڕێك نەخستبێت ، ڕێك خرابێت | ئاوارەبووبێت ، ئاوارەنەبووبێت |

وەکو : پێویستە وانەکەی خوێندبێت .

3= ڕێژەی ڕابردووی دووری دانانی :

ڕێژەی ڕابردووی دووری ڕاگەیاندن + نیشانەی (با)

| نمونە بۆکاری تێپەڕ ( ئەرێ و نەرێ ، بکەرنادیار) | نمونە بۆکاری تێنەپەڕ (ئەرێ و نەرێ) |
|---|---|
| سادە / نوسیبووبا ، نەنوسیبووبا ، نووسرابووبا | خنکابووبا ، نەخنکابووبا |
| دارِژاو / داخستبووبا ، دانەخستبووبا ، داخرابووبا | دەرچووبووبا ، دەرنەچووبووبا |
| خستبووبایەوە ، نەخستبووبایەوە ، نەخرابووبایەوە | حەسابووبایەوە ، نەحەسابووبایەوە |
| لێکدراو / داگیرکردبووبا ، داگیرنەکردبووبا ، داگیرکرابووبا | پێش کەوتبووبا ، پێش نەکەوتبووبا |

وەکو : خۆزگە ئەمساڵ بەرزترین نمرەم هێنابووبا

**4- ڕێژەی ڕانەبردووی دانانی :**

**نیشانەی (ب) + ڕەگی کار + جێناوی کەسی لکاو ( م- ین ، یت _ ن ، ات ،ێت – ن)**

| نموونە بۆ کاری تێپەڕ ( ئەرێ و نەرێ ، بکەرنادیار ) | نمونە بۆکاری تێنەپەڕ ( ئەرێ و نەرێ ) |
|---|---|
| سادە / بچێنم ، نەچێنم ، نەچێنرێ | بنووم ، نەنووم |
| دارڕژاو / دابگرین ، دانەگرین ، دانەگیررێ | بگەڕێمەوە ، نەگەڕێمەوە |
| ببەمەوە ، نەبەمەوە ، نەبرێتەوە | دابنیشم ، دانەنیشم |
| لێکدراو / پەروەردە بکەین ، پەروەردە نەکەین ، پەروەردەنەکرێ | دەربازببێت ، دەربازنەبێت |

**وەکو : پێویستە منداڵەکانمان بە باشی پەروەردە بکەین .**

**تێبینی 1: لە شێوازی ڕانەبردووی دانانیدا ئەگەر کارەکە دارڕژاو بوو یان لێکدراو بوو دەگونجێت نیشانەی (ب) دەرنەکەوێت بۆ ئاسانی دەربڕین**

**وەکو : دەبێت ئاڵاکە هەلکەم ( هەڵبکەم ) ، دەبوو ڕاپۆرتەکە پێشکەش کەم ( پێشکەش بکەم ).**

**تێبینی 2 : هەموو ڕێژەکانی شێوازی دانانی بە ئامرازی (نە) نەرێ دەکرێن بەلام لە دەمی ڕانەبردووی دانانیدا ئامرازی (نە) شوێنی نیشانەی (ب) دەگرێتەوە ، وەکو : نەخوێندبا ، نەخوێندبێت ، نەخوێندبووبا ، نەخوێنم .**

**تێبینی 3 : لەگەڵ ڕێژەکانی شێوازی دانانیدا مەرجە هەندێ کاری یاریدەدەری وەکو ( دەمەوێ ، دەشێت ، دەبوو ، دەوێرم ، دەبێت ..هتد)**

**بەکاردێت یان هەندێ وشەی یاریدەدەری وەکو ( خۆزگە ، ڕەنگە ، بریا ، کاشکی ، لەوانەیە ... هتد ) بەکاربێت .**

**وەکو : دەبوو هۆنراوەکە لەبەربکەم ، خۆزگە بەیەکەم دەرچووبام .**

**تێبینی 4 : لەکاتی گۆڕینی ڕستەی شێوازی دانانی بۆ ( ڕاگەیاندن و داخوازی ) ئەم کارە یاریدەدەر و وشە یاریدەدەرانە لادەبرێن وە بەپێچەوانەشەوە وەکو :**

**پێویستە ڕاهێنانەکە بنووسن ⟵ ڕاهێنانەکە بنووسن .**

**نەدەبوو زەوییەکەت چاندبا ⟵ زەوییەکەت چاند ؟**

پ1/ لە ڕستەی (دەبێت ڕۆژنامەکە بخوێنمەوە ) .... 1- (دەبێت) چی یە ؟ ئەرکی چی یە ؟ 2- کوا بکەری ڕستەکە ؟ بۆچی لەو شوێنەدایە ؟ 3- کاری ڕستەکە لە چی ڕێژەیەکدایە ؟ 4- کاری ڕستەکە بگۆڕە بۆ ڕاگەیاندن و ڕستەکە بنوسەرەوە

وەلام / 1- دەبێت : کاری یاریدەدەرە و ئەرکی تەواوکردنی واتای کاری سەرەکی پێ سپێردراوە . 2- (م)بکەری ڕستەکەیە چونکە کاری ڕستەکە ڕانەبردووە . 3- کاری ڕستەکە لە ڕێژەی ڕانەبردووی دانانی دایە . 4- (ڕۆژنامەکە دەخوێنمەوە).

# ڕێژەی کار

ڕێژەی کار : ئەو شێوەیەیە کە کار بەپێی دەم و کەس و ژمارەی کەس لە گەردان کردندا دەردەکەوێت ، هەموو کارێکیش شەش ڕێژەی هەیە ، وەکو:

| تێپەڕ | | تێنەپەڕ | |
|---|---|---|---|
| خوێندم | خوێندمان | هاتم | هاتین |
| خوێندت | خوێندتان | هاتیت | هاتن |
| خوێندی | خوێندیان | هات | هاتن |

تێبینی :

لە ڕێژەی کاردا دەبێ ڕەچاوی ئەم خالانە بکرێت :

1- جۆری کارەکە (تێپەڕە یان تێنەپەڕە یان داخوازی یە)

2- پێکهاتنی کارەکە (سادە یان دارێژراو یان لێکدراوە )

3- کام جێناوی لکاو وەردەگرێت و دەچێتە کوێی کارەکەوە

أ / کاری ڕابردووی تێپەڕ ( ڕاگەیاندن و دانانی )

دەدرێنە پاڵ کۆمەڵە جێناوی لکاوی یەکەم ( م - مان ، ت - تان ، ی - یان )

1- لە دەمی ڕابردووی نزیکی ڕاگەیاندندا جێناوەکان دەچنە کۆتایی کارەکان وەکو :

نوسیم - نوسیمان ، نوسیت - نوسیتان ، نوسی - نوسییان

2- لەدەمی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندا جێناوەکان دەچنە نێوان نیشانەی (وە ،ووە) وەکو :

نوسیومە - نوسیومانە ، نوسیوتە - نوسیوتانە ، نوسیویە(تی) - نوسیویانە

3- لەدەمی ڕابردووی دووری ڕاگەیاندندا جیناوەکان دەچنە دوای نیشانەی (بوو) وەکو :

نوسیبووم - نوسیبوومان ، نوسیبووت - نوسیبووتان ، نوسیبووی - نوسیبوویان

4- لەدەمی ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندندا جێناوەکان دەچنە دوای نیشانەی (دە) دوە ، وەکو :

دەم نوسی - دەمان نوسی ، دەت نوسی - دەتان نوسی ، دەی نوسی - دەیان نوسی

**5- لەدەمی ڕابردووی (نزیک ، تەواو ، دوور) ی دانانیدا جێناوەکان دەچنە دوای نیشانەکانی (با ، بێت ، بووبا)**

**ڕابردووی نزیکی دانانی : نوسیبام – نوسیبامان ، نوسیبات – نوسیباتان ، نوسیبای – نوسیبایان**

**ڕابردووی تەواوی دانانی : نوسیبێتم – نوسیبێتمان ، نوسیبێتت – نوسیبێتتان ، نوسیبێتی – نوسیبێتیان**

**ڕبردووی دووری دانانی : نوسیبووبام – نوسیبووبامان ، نوسیبووبات – نوسیبووباتان ، نوسیبووبای – نوسیبووبایان**

**تێبینی : ئەگەر کارەکە دارڕاو بوو بە پاشگری (ەوە) ئەوا ڕێژەی کارەکە بەهەمان دەستووری خاڵەکانی سەرەوە دەبێت و تەنها گورانکاری لەوەدایە کە پاشگرەکە دەخرێتە دوای جێناوە لکاوەکە لە کۆتایی کارەکە ،وەکو :**

**بردنەوە ← بردمەوە بردمانەوە → ڕابردووی نزیك**

**بردوتەتەوە بردوتانەتەوە → ڕابردووی تەواو**

**دەی بردەوە دەیان بردەوە → ڕابردووی بەردەوام**

**بردبوومەوە بردبوومانەوە → ڕابردووی دوور**

**ئەگەر کارەکە نیشانەی ( اند) ی وەرگرتبوو بەهەمان شێوەی دەستووری سەرەوەیە :**

**برژاندم – برژاندوومانە ، دەمان برژاند – برژاندبوومان**

**تێبینی : (1)ئەگەر کارەکەڕابردووی تێپەڕی ڕاگەیاندن یان دانانی نەرێ بوو ئەوا جێناوەکان دەچنە دوای ئامرازی نەرێ (نە) دوە ، وەکو :**

**نەم نوسی __ نەمان خوێندووە __ نەت دەکرێ __ نەم گەیاندبوو/ نەم گەیاندبا / نەم گەیاندبێت / نەم گەیاندبووبا**

**(2) ئەگەر کارەکە لە ڕووی پێکهاتنەوە دارڕاو یان لێکدراو بوو ئەوا جێناوەکان دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە ، وەکو :**

**1- ڕێژەی ڕابردووی تێپەڕی ڕاگەیاندن :**

| نزیك | تەواو | بەردەوام | دوور |
|---|---|---|---|
| دەرم چاند | دەرمان چاندووە | دەرت دەچاند | دەرتان چاندبوو |
| فێری کرد | فێریان کردووە | فێرم دەکرد | فێرمان کردبوو |
| بانگم نەکرد | بانگمان نەکردووە | بانگت نەدەکرد | بانگتان نەکردبوو |

**2- ڕێژەی ڕابردووی تێپەڕی دانانی :**

| نزیك | تەواو | دوور |
|---|---|---|
| ڕام گرتبا | ڕامان گرتبێت | ڕات گرتبووبا |
| ڕێکم خستبا | ڕێکمان خستبێت | ڕێکت خستبووبا |
| تەواوم نەکردبا | تەواومان نەکردبێت | تەواوت نەکردبووبا |

**کاری ڕابردووی تێنەپەڕ:**

**- ن ) هەمیشە جێناوەکان دەچنە کۆتایی کارەکە ، جگە لە کاری ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن کە جێناوەکان دەچنە نێوان (وە ، ووە )**

**.**

**ڕێژەی ڕابردووی تێنەپەڕی ڕاگەیاندن :**

| نزیك | تەواو | بەردەوام | دوور |
|---|---|---|---|
| کەوتم | کەوتوومە | دەکەوتم | کەوتبووم |
| هەڵکەوتم | هەڵکەوتووینە | هەڵدەکەوت | هەڵکەوتبووین |
| سەرکەوتم | سەرکەوتووینە | سەردەکەوت | سەرکەوتبوون |

**ڕێژەی ڕابردووی تێنەپەڕی دانانی :**

| نزیك | تەواو | دوور |
|---|---|---|
| نووستبام | نوستبێتم | نوستبووبام |
| نوستباین | نوستبێتین | نوستبووباین |
| دانیشتباین | دانیشتبێتیت | دانیشتبووبایت |
| دەربازبووبان | دەربازبووبێتن | دەربازبووبوویان |

**پ/ کەی جێناوی لکاوی ڕێژەی کار بۆ کەسی سێیەمی تاك دەرناکەوێت ؟ لەگەڵ چی ڕێژەیەکی کار ؟ بۆچی ؟**

**وەلام / ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێنەپەڕ بێت ئەوا جیناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك دەرناکەوێت چونکە نیمانە لە کۆمەڵە**

**- ن ) وەکو : کەوت ، هەڵکەوت ، سەرکەوت**

## کاری ڕانەبردوو :

کاری ڕانەبردووی ڕاگەیاندن و دانانی بە تێپەڕ و تێنەپەڕیەوەدەدرێتە پاڵ کۆمەڵە جێناوی لکاوی سێیەم (م-ین، یت-ن،ات،ێت-ن)

وەهەمیشە جێناوەکان دەچنە کۆتایی ڕەگی کارەکەوە :

1) ڕانەبردووی ڕاگەیاندن :

| | نمونە بۆ تێپەڕ | | نمونە بۆ تێنەپەڕ | |
|---|---|---|---|---|
| سادە | دەنووسم | دەنوسین | دەڕۆم | دەڕۆین |
| داڕژاو | دەردەکەیت | دەردەکەن | دەردەچیت | دەردەچن |
| لیکدراو | فێردەکات | فێردەکەن | نقووم دەکات | نقووم دەکەن |

2) ڕانەبردووی دانانی :

| | نمونە بۆ تێپەڕ | | نمونە بۆ تێنەپەڕ | |
|---|---|---|---|---|
| سادە | بخۆم | بخۆین | بنووم | بنووین |
| داڕژاو | ڕابماڵیت | ڕابماڵن | داببەزین | داببەزن |
| لێکدراو | دروست بکات | دروست بکەن | سەربکەوێت | سەربکەون |

چەند شێوەیەکی پرسیار لەسەر شێوە و ڕێژەکان :

**پ1** / لە چاوگی (بردنەوە ، هاتنەوە) ئەم ڕێژانەی خوارەوە دروست بکە و بیدە پاڵ کەسی دووەمی کۆ (تان ، ن) :

**1**- ڕێژەی رابردووی تەواوی دانانی

بردبێتتانەوە ، هاتبێتنەوە

**2**- ڕێژەی داخوازی

ببەنەوە ، بێنەوە

**3**-ڕێژەی ڕابردووی دووری دانانی

بردبووباتانەوە ، هاتبووبانەوە

**4**- ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندن

بردووتانەتەوە ، هاتوونەتەوە

**پ2 / کەی جێناوی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکەوە ؟**

**وەلام / ئەگەر کارەکە ڕابردووی تێپەڕی دارژاو بە پێشگر یان لێکدراو بێت ئەوا جیناوە لکاوەکان دەچینە دوای بەشی یەکەمی کارەکەوە، وەکو : هەلم گرت هەلمان گرت**

**پ3 / کەی جێناوی لکاو لە ڕێژەی کاردا دەچێتە نێوان نیشانەی(وە،ووە) وە؟**

**وەلام / کاتێك جێناوی لکاو دەچێتە نێوان نیشانەی (وە) ئەگەر کۆتایی قەدی کارەکە بە پیتی (ا،ی،و) وەکو : کێلاومە ، کڕیومە ، درووومە ، وە کاتێك جێناوی لکاو دەچێتە نێوان نیشانەی (ووە) ئەگەر قەدی کارەکە بە پیتی (د،ت)کۆتایی هاتبوو، وەکو : گرتوومە ، خواردوومە.**

**پ4/ کاری (دانەنیشتبا) ،(ڕازاندووەتەوە) بدە پاڵ : 1- کەسی دووەمی تاك. 2- کەسی سێیەمی تاك ؟**

**وەلام / 1- دانەنیشتبایت ، ڕازاندووتەوە . 2- دانەنیشتبا ، ڕازاندوویەتەوە .**

---

# سێیەم / شێوازی داخوازی

**ئەو ڕێژەیەیە کە قسەکەر بە شێوەی داوا و فەرمان ، داوا لەکەسی دووەمی تاك یان کۆ دەکات بۆ بەجێهێنان یان بەجێنەهێنانی کارێك . شێوازی داخوازی بەم یاسایە دروست دەکرێت :-**

**(ە) بۆ کەسی دووەمی تاك**



**نیشانەی (ب) + ڕەگی کاری ڕانەبردوو + جێناوی لکاوی (ن) بۆ کەسی دووەمی کۆ**

**بخوێنە ×مەخوێنە ، بخوێنن × مەخوێنن**

**هەڵبژێرە × هەڵمەبژێرە ، هەڵببژێرن × هەڵمەبژێرن**

**فێربکەن × فێرمەکەن ، بڕۆ × مەڕۆ**

تێبینی : (**1**)کاری داخوازی بە ئامرازی (مە) نەرێ دەکرێت وەکو : کاری نابەجێ مەکەن .

**2**) لە شێوازی داخوازیدا ئەگەر کارەکە لە ڕووی دارشتنەوە دارژاو یان لێکدراو بوو دەگونجێت نیشانەی (ب) دەرنەکەوێ، بۆ ئاسانی دەربڕین وەکو : **1**- پارەکە هەلگرە.(هەلبگرە) **2**- کارەکە تەواوکە . (تەواو بکە)

پ/ کەی جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاك وەك بکەر دەرناکەوێت ؟

وەلام / ئەگەر ڕەگی کارەکە کۆتایی بە پیتی بزوێنی (ۆ،ە،ی،ێ،وو) هاتبوو وەکو :

**1**- نانەکە بخۆ . **2**- ڕۆژنامەکە ببە . **3**- بەسەربەستی بژی . **4**- هۆنراوەکە بلێ . **5**- کراسەکە بدروو .

تێبینی **3**) : کاری داخوازی هەیە لە دەستوور لادەدات بە تایبەتی کە دەدرێتە پاڵ کەسی دووەمی تاك وەکو (بچۆ،وەرە،هەرە)

تێبینی **4**) : لەکاری داخوازیدا لەپاڵ کەسی دووەمی تاك ئەگەر کارەکە بە پاشگری (ەوە) کۆتایی هاتبوو ئەوا پیتی ناوبەندی (ر) دەکەوێتە نێوان جێناوی لکاوی بکەر (ە) و پاشگرەکەوە ، وەکو : (بخوێنەرەوە ، بهێنەرەوە ) بەلام ئەگەر کۆتایی ڕەگی کارەکە پیتێکی بزوێن بوو ، ئەوا دیسان پیتی (ر) دەکەوێتە نێوان ڕەگی کارەکە و پاشگرەکەوە ، وەکو (بکەرەوە ، بخۆرەوە)

تێبینی **5**): ئەگەر کاری داخوازی بە (ە) کۆتایی هاتبوو ، کارەکە بکە بەکۆ ئەگەر (ە) گۆڕا بۆ (ن) ئەوا (ە) جێناوی لکاوی بۆ کەسی دووەمی تاك بکەرە . وەکو : بکرە بکرن ، ئەگەر (ە) نەگۆڕا و مایەوە ئەوا (ە) جێناوی لکاو نیە بۆکەسی دووەمی تاك بەلکو بەشێکە لە ڕەگی کارەکە کەواتە (ە) وەکو بکەر دەرنەکەوتووە نمونە : خستن بخە ( بارەکە بخ====ە) بەشێکە لە ڕەگی کارەکە

پ**1** / کەی جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاك لە ڕێژەی داخوازیدا دەردەکەوێت ؟

و/ ئەگەر کۆتایی ڕەگی کارەکە پیتێکی نەبزوێن بوو ، وەکو : بخوێنە ، بکرە .

پ**2** / کەی دەتوانرێ لە ڕێژەی داخوازیدا نیشانەی (ب) دەرنەکەوێت ؟ بۆچی ؟

و/ ئەگەر کاری داخوازی دارژاو بە پێشگر یان لێکدراو بوو ، بۆ ئاسانی دەربڕین ، وەکو : نوێنەرەکە هەلبژێرە "(هەلببژێرە )یە"

پ**3** /لە ڕێژەی داخوازیدا (ە) چییە ؟ کەی دەرناکەوێ ؟ بۆچی ؟

و/ (ە) جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاك ، کاتێ دەرناکەوێ ئەگەر کۆتایی ڕەگی کارەکە بە پیتی بزوێن (ۆ،ی،ە،ێ،وو)کۆتایی هاتبوو وەکو : لەسەرخۆ برۆ ، کارەکە بکە ، بەسەربەرزی بژی ، هۆنراوەکە بلێ ، کراسەکە بدروو.

پ4/ لە ڕستەی (نانەکەت بخۆ) 1- چی دەرنەکەوتووە و بۆچی؟ 2- (ت) چی یە ؟ ئەرکی چی یە ؟ 3- بۆچی لەو شوێنەدایە؟

و/ 1- جێناوی لکاوی بکەر دەرنەکەوتووە ، چونکە ڕەگی کارەکە بە پیتی بزوێن کۆتایی هاتووە .

2- (ت) جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی تاك ، دیارخەری ناوە .

3- چونکە (ت) لە کۆمەڵە جێناوی لکاوی (م-مان، ت-تان ، ی-یان) لە ئەرکی دیارخەری ناو دەچنە سەر بەرکار.

## چوارەم / شێوازی مەرج

شێوازی مەرج : لەکاتی بەکارهێنانی کار لە ڕستەدا ئەگەر ڕوودانی کارێك مەرج بێت بۆ ڕوودانی کارێکی تر ، لەو بارەیدا بەو کارە ، بە ڕێژەو ناوەڕۆکییەوە دەوترێ ڕستەی ئاوێتەی مەرج (شێوازی مەرج).

ڕستەی شێوازی مەرج هەمیشە ڕستەیەکی ئاوێتە مەرجە و لە دوو ڕستەی سادە پێك هاتووە :

1- ڕستەی کاری مەرج (پارستە) کە ڕستەیەکی سەرەکی نیە و ئامرازی لێکدەری مەرجی دەکەوێتە پێشیەوە .

2- ڕستەی وەڵامی مەرج (شارستە) کە ڕستەیەکی سەرەکیە و مەبەستەکە لەم ڕستەیە دەردەکەوێت و ئامرازی لێکدەری مەرج ناکەوێتە پێشیەوە .

پ1/ئایا لە ڕستەی ئاوێتەی مەرجدا کار ڕێژەی تایبەتی خۆی هەیە ؟ چۆن؟

وەڵام / نەخێر کار ڕێژەی تایبەتی خۆی نیە، بەڵکو هەر ئەو کارانەن کە لە شێوازی (ڕاگەیاندن ، دانانی ، داخوازی ) بەکارهێنراون بەڵام لێرەدا بۆ مەبەستی بنجی خۆیان بەکارنەهێنراون ،بەڵکو بۆ مەبەستی مەرج بەکارهێنراون.

پ2/ لە ڕستەی ئاوێتەی مەرجدا چەند جۆر کار هەیە؟ لە چی ڕێژەیەکدا دەبن و بۆچی بەکاردەهێنرێن؟بەنمونەوە ڕونی بکەوە

وەڵام/ 1- ڕستەی کاری مەرج : ڕێژەی کار هەمیشە ڕاگەیاندن یان دانانی یە گەر تێپەڕ بێت یان تێنەپەڕ ، بکەردیار یان بکەرنادیار ، ئەرێ یان نەرێ بێت. وەکو :

گوڵەکانم چاندووە ، ئەگەر ئاژەڵ نەیان خوات . (دانانی)

کەنەورۆز هات ، دەچین بۆ سەیران. (ڕاگەیاندن)

4- رستەی وەلامی مەرج : ڕێژەی کار هەمیشە ڕاگەیاندنە یان داخوازی یە ، بە ئەریٚ و نەریٚ و بکەردیار و بکەرنادیارەوە وەکو :

کەی چویت بۆ بازاڕ ، ڕۆژنامەکە بکڕە . (داخوازی)

هەتا ڕەنج نەکێشیت ، گەنج نانۆشیت . (ڕاگەیاندن)

تێبینی : (1) لە ڕستەی ئاوێتەی مەرجیدا بە شێوەیەکی گشتی ڕستەی کاری مەرج دەکەوێتە سەرەتای ڕستەوە ، بەلاّم دەگونجێت وەلاّمی مەرج بکەوێتە سەرەتای ڕستەکەوە ، وەکو : یەکبگرن ، دەنا سەرناکەون .

(2) لەڕستەی ئاوێتەی مەرجدا ئامرازی لێکدەر ئەمانەن : (تا، هەتا، هەکە ، کەی ، گەر ، ئەگەر ،دەنا ...هتد )

3) لە ڕستەی ئاوێتەی مەرجدا تەنها ئەو کارانە دەکرێن بە بکەرنادیار کە تێپەڕن ،وەکو :

ئەگەر زەوی نەکێلرێت، تۆوی پێوە ناکرێت . هەتا بەردەکە نەهاوێژرا ، پەنجەرەکە نەشکێنرا.

پ/ زەنگەکە لێبدە ، تا خوێندکارەکان بچنە ژووریٚ

1- چی جۆرە ڕستەیەکە ؟ و/ ڕستەی ئاوێتەی مەرجە .

2- (تا) چییە ؟ بۆچی بەکارهاتووە ؟

و/ (تا) ئامرازی لێکدەری مەرجە بۆ لێکدانی ڕستەی کاری مەرج و ڕستەی وەلاّمی مەرج بەکارهاتووە.

3- ڕستەی کاری مەرج و ڕستەی وەلاّمی مەرج دیاری بکە ؟

(تاخوێندکارەکان بچنە ژووریٚ ) ڕستەی کاری مەرجە ،(زەنگەکە لێبدە) ڕستەی وەلاّمی مەرجە.

4- کار لە ڕستەی کاری مەرج و ڕستەی وەلاّمی مەرج لە چی ڕێژەیەکدان ؟

بچن : لە ڕێژەی ڕانەبردووی دانانی دایە ، لبیدە : لە ڕێژەی داخوازی دایە .

5- بکەر لە ڕستەی کاری مەرج چییە ؟ بکەر لە ڕستەی وەلاّمی مەرج کامەیە ؟ بۆچی ؟

و/ لە ڕستەی کاری مەرج (ن) بکەری ڕستەکەیە ، لە ڕستەی وەلاّمی مەرج (ە) دەرنەکەوتووە ، چونکە ڕەگی کارەکە بە پیتی بزوێن کۆتایی هاتووە.

# ئەرکی جێناوی لکاو لەدەوری بکەردا

**کۆمەلەی یەکەم (م-مان، ت-تان،ی-یان) هەمیشە لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا دەبن بە بکەر بەم شێوەیەی خوارەوە :**

**أ- ئەگەر بەرکار باس کرابێت ئەوا جێناوی لکاوی بکەر دەچێتە دوای بەرکارەکە وەکو :**

**ڕۆژنامەیەکم خوێندەوە ، نوێنەرەکەمان هەلبژارد ، کارەکەیان تەواوکرد .**

**ب- ئەگەر بەرکار باس نەکرابێت ئەوا :**

**1- ئەگەر کارەکە لەڕووی پێکهاتنەوە سادە بێت ئەوا :-**

**° لە دەمی ڕابردووی نزیك و دووری ڕاگەیاندندا جێناوەکان دەچنە کۆتایی کارەکە وەکو :**

**نووسیم - نوسیمان ، نوسیت - نوسیتان ، نوسی - نوسییان .**

**خوێندبووم - خوێندبوومان ، خوێندبووت - خوێندبووتان ، خوێندبووی - خوێندبوویان .**

**°لەدەمی ڕابردووی بەردەوامی ڕأگەیاندندا جێناوەکان دەچنە دوای نیشانەی (دە) وەکو:**

**دەم کرِی - دەمان کرِی ، دەت کرِی - دەتان کرِی ، دەی کرِی - دەیان کرِی .**

**°لەدەمی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندا جێناوەکان دەچنە نێوان نیشانەی (وە،ووە) وەکو :**

**ناردوومە-ناردوومانە ، ناردووتە - ناردووتانە ، ناردوویە(تی) - ناردوویانە .**

**°ئەگەر کارەکە نەرێ بێت ، ئەوا جێناوەکان لەهەموو دەمەکانی ڕابردوودا دەچنە دوای ئامرازی نەرێکەوە (نە) وەکو :**

**نەم نووسی ، نەم نووسی بوو ، نەم دەنووسی ، نەم نووسیوە**

**2- ئەگەر کارەکە لە ڕووی پێکهاتنەوە دارِژاو یان لێکدراو بێت هەمیشە جێناوەکان دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە ، وەکو : ڕام هێنا - ڕامان هێنا ، ڕات هێنا - ڕاتان هێنا ، ڕای هێنا - ڕایان هێنا**

**بانگم نەکرد - بانگمان نەکرد ، بانگت نەکرد - بانگتان نەکرد ، بانگی نەکرد - بانگیان نەکرد**

**تێبینی : ئەگەر کارە لێکدراوەکە لە سێ ووشەی واتادار پێکهاتبوو ، واتە بەشی یەکەمی کارە لێکدراوەکە وشەیەکی لێکدراو**

بوو ،بەرکار باس نەکرابوو ، ئەوا جێناوی لکاوی بکەر دەکەوێتە دوای ووشە لێکدراوەکە وەکو:

سەربەسەرم کرد ، دەست نیشانمان کرد ، مالئاواییم لێ نەکرد

( ن -

ئەم کۆمەلە جێناوە هەمیشە لەگەڵ کاری ڕابردووی تێنەپەڕدا دەبن بە بکەر و دەچنە کۆتایی کارەکە ، جگە لەدەمی ڕابردووی تەواو کە جێناوەکان دەچنە نێوان نیشانەی (وە – ووە) وەکو :

1- پار چوین بۆ هەندەران . 2- بەپەلە گەڕانەوە . 3- نوستوویتە ؟ 4- سەرکەوتینەوە

| هاتم | هاتین | هاتومە | هاتوینە | دەهاتم | دەهاتین | هاتبووم | هاتبووین | هاتمەوە | هاتینەوە |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| هاتیت | هاتن | هاتویتە | هاتوونە | دەهاتیت | دەهاتن | هاتبوویت | هاتبوون | هاتیتەوە | هاتنەوە |
| هات | هاتن | هاتووە | هاتوونە | دەهات | دەهاتن | هاتبوو | هاتبوون | هاتەوە | هاتنەوە |

## کۆمەڵەی سێیەم ( م – ین ، یت – ن ، ات ، ێت – ن )

ئەم کۆمەڵەیە هەمیشە لەگەڵ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ و تێنەپەڕ دەبن بە بکەر و دەچنە کۆتایی کارەکە ، وەکو :

ڕۆژنامەکە دەکرین . 2- شانۆگەرییەکە نمایش ناکات . 3- نەمامەکە دەچێنێت

ooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooooo

پ1 / لە ڕستەی ( ڕاپۆرتەکەیان نووسیوەتەوە )

1- (یان) چییە ؟ئەرکی چییە ؟ بۆچی لەو شوێنەدایە ؟

و/یان : جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی کۆ ، ئەرکی بکەرە ، چونکە بەرکار باسکراوە.

2- کاری ڕستەکە لە چی ڕێژەیەکدایە ؟

و/ کاری ڕستەکە (نوسیوەتەوە) لە ڕێژەی ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندندایە .

3– ئەگەر وشەی « ڕاپۆرتەکە » لابەریت ، ئەوا (یان) دەچێتە کوێ ؟ بۆچی؟

و/ (یان) دەچێتە نێوان نیشانەی (وە) دەبێ بە (نوسیویانەتەوە) چونکە ڕێژەکە ڕابردووی تەواوی ڕاگەیاندنە .

پ2 / کەی جێناوی لکاو لە دەوری بکەردا دەرناکەوێت ؟ باسی بکە بە نمونەوە

و/1– ئەگەر کارەکە داخوازی بێت و بە پیتی بزوێن کۆتایی هاتبێت وەکو : بەسەربەستی بژی.

2– ئەگەر کارەکە ڕابردووی تێنەپەڕ بێت و درابێتە پاڵ کەسی سێیەمی تاك وەکو : هات .

پ3 / کەی جێناوی لکاوی (ات) دەبێت بە بکەر ؟ باسی بکە بەنمونەوە

و/ کاتێك (ات) دەبێت بە بکەر ئەگەر کارەکە ڕانەبردووی تێپەڕ یان تێنەپەڕ بێت و کۆتایی بە پیتی بزوێنی (ە،ۆ) هاتبێ

وەکو : دەگات ،دەخوات

پ4 / کەی جێناوی لکاوی (ێت) شوێنی جێناوی لکاوی (ات) دەگرێتەوە لەدەوری بکەردا ؟باسی بکە بە نمونەوە

و/ کاتێك کارەکە ڕانەبردوو بێت و کۆتایی کارەکە کۆتایی بەپیتی بزوێنی (ە،ۆ)نەهاتبێ وەکو : دەخوێنێت ، دەچێت .

پ5 / ئەو جێناوە لکاوانە کامانەن کەلەدەوری بکەردا دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە ؟ باسی بکە بە نمونەوە

و/ جێناوە لکاوەکانی کۆمەڵەی یەکەم (م–مان، ت–تان،ی–یان)دەبن بەبکەر و دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە

ئەگەر کارەکە داڕێژراو بێت بە پێشگر یان لێکدراو بێت وەکو : وەرم گرت –وەرمان گرت ، فێرت کرد – فێرتان کرد

## ئەرکی جێناوی لکاو لەدەوری بەرکاردا

بۆ ئەرکی جێناوی لکاو لەدەوری بەرکاردا مەرجە :

1- کاری رستەکە تێپەڕ بێت . 2- هەمیشە دوو جێناوی لکاو دەچنە سەر کارەکە .

کۆمەڵەی یەکەم (م- مان ، ت - تان ، ی - یان ) لەگەڵ ئەم کارانەی خوارەوەدا دەبنە بەرکار :

1- کاری داخوازی تێپەڕ : ( سادە ، دارڕاو ، لێکدراو )

کۆمەڵە جێناوی (م- مان ، ی - یان) دەبنە بەرکار ، ئەگەر کارەکە سادە بێت ئەوا دەچنە سەر نیشانەی (ب) ، خۆ ئەگەر کارەکە دارڕاو بە پێشگر یان لێکدراو بێت ئەوا دەچنە دوای بەشی یەکەمی کارەکە ، وەکو :

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| بم بەخشە | بمان بەخشە | وەرم بگرن | وەرمان بگرن | بانگم بکەن | بانگمان بکەن |
| بی بەخشە | بیان بەخشە | وەری بگرن | وەریان بگرن | بانگی بکەن | بانگیان بکەن |

2- کاری ڕانەبردووی تێپەڕ :

أ- ئەگەر کارەکە سادە بێت ئەوا جێناوی لکاو وەکو بەرکار دەچنە سەر نیشانەی (دە) وەکو :

دەم بینێت - دەمان بینێت ، دەت بینێت - دەتان بینێت ، دەی بینێت - دەیان بینێت

ب- ئەگەر کارەکە دارڕاو بوو یان لێکدراو بوو ئەوا جێناوی لکاو وەکو بەرکار دەچێتە سەر بەشی یەکەمی کارەکە ، وەکو:

دام دەمەزرێنێت - دامان دەمەزرێنێت ، دات دەمەزرێنێت - داتان دەمەزرێنێت ، دای دەمەزرێنێت -دایان دەمەزرێنێت

فێرم دەکات - فێرمان دەکات ، فێرت دەکات - فێرتان دەکات ، فێری دەکات - فێریان دەکات

3-کاری ڕابردووی تێپەڕ: ئەگەر کارەکە سادە بوو ئەوا دوو جێناوی لکاو لە کۆمەڵەی یەکەم (م-مان....) دەچنە سەر کارەکە یەکەمیان بەرکارە و دووەم بکەرە ، وەکو

| سادە | | دارڕاو | | لێکدراو | |
|---|---|---|---|---|---|
| ناردمی | ناردمانی | هەڵمی بژارد | هەڵمانی بژارد | بانگمی کرد | بانگمانی کرد |
| ناردتی | ناردتانی | هەڵتی بژارد | هەڵتانی بژارد | بانگتی کرد | بانگتانی کرد |
| ناردی | ناردیانی | هەڵی بژارد | هەڵیان بژارد | بانگی کرد | بانگیانی کرد |

( ن –

أ- ئەگەر کارەکە سادە بێت :

ئەگەر بکەر کەسی یەکەم یان دووەمی تاك و کۆ بێت ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار دەچێتە دوای جێناوی لکاوی بکەر ، وەکو :

| | |
|---|---|
| ناردمیت – ناردمن | ناردمانیت – ناردمانن |
| ناردمانن – | |

ب- ئەگەر کارەکە دارِژاو یان لێکدراو بێت ئەوا جێناوی لکاوی بەرکار دەچێتە کۆتایی کارە دارِژاوەکە یان لیکدراوەکەوە وەکو :

هەلی بژارم – هەلی بژاردین / هەلی بژاردیت – هەلی بژاردن / هەلی بژارد – هەلی بژاردن ( دارِژاو )

فێری کردم – فێری کردین / فێری کردیت – فێری کردن / فێری کرد – فێری کردن ( لێکدراو )

تێبینی : 1) ئەگەر بکەر کەسی یەکەمی تاك و کۆ بێت لەکۆمەڵەی یەکەم ( م – مان ) بەرکار وەکو کەسی یەکەمی تاك و کۆ لە کۆمەڵەی دووەم ( م – ین ) دەرناکەوێت وەکو :

| | | | |
|---|---|---|---|
| ناردمیت | ناردمن | ناردمانیت | ناردمانن |
| ناردم | ناردمن | ناردمان | ناردمانن |

2) ئەگەر بکەر کەسی دووەمی تاك و کۆ بێت لە کۆمەڵەی یەکەم (ت – تان) ، ئەوا بەرکار وەکو کەسی دووەمی تاك و کۆ لە کۆمەڵەی دووەم (یت – ن) دەرناکەوێت وەکو :

| | |
|---|---|
| ناردتم – ناردتین | ناردتانم – ناردتانین |
| – ناردتانن | |

3) ئەگەر بکەر کەسی سێیەمی کۆ (یان) بێت لە کۆمەڵەی یەکەم ، ئەوا هەموو جێناوە لکاوەکانی کۆمەڵەی دووەم (م- ین) وەکو بەرکار دەردەکەون و دەچنە دوای جێناوی لکاوی بکەرەوە ، وەکو :

ناردیانن –

4) ئەگەر بکەر کەسی سێیەمی تاك (ی) لە کۆمەڵەی یەکەم بێت ، ئەوا هەموو جێناوە لکاوەکانی کۆمەڵەی دووەم

(م - ین) وەکو بەرکار دەردەکەون و دەچنە پێش جێناوی لکاوی بکەرەوە ، وەکو :

= خستنی

° سەرنج : لە بیرتان نەچێت لەگەڵ هەر چوار تێبینیەکەدا جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ وەکو

= ن) وەکو :

ناردم ، ناردمان ، ناردت ، ناردتان ، ناردی ، ناردیان ، خستم ، هەڵم خست ، سەرم خست .

لە کرمانجی ژووروودا کۆمەڵە جێناوی لکاوی دووەم لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا دەبنە (بەرکار) و دەچنە کۆتایی کارەکە وەکو :

ئازادی ئەز دیتم - ئازادی ئەم دیتن / ئازادی تو دیتن - ئازادی هوین دیتن / ئازادی ئەو دیت - ئازادی ئەو دیتن

پ1/ کەی جێناوی کەسی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك لەدەوری بەرکاردا دەردەکەوێت ؟ کەی دەرناکەوێت ؟

و/ کاتێك جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك دەردەکەوێت لەدەوری بەرکاردا ئەگەر کارەکە ڕانەبردووی تێپەڕ یان داخوازی تێپەڕ

بێت وەکو : دەیبینم ، بینووسە. وەکاتێك دەرناکەوێت ئەگەر کارەکە ڕابردووی تێپەڕ بێت و درابێتە پاڵ کۆمەڵە جێناوی لکاوی دووەم

=ن)چونکە بۆ کەسی سێیەمی تاك جێناوی لکاومان نییە وەکو : خستم

پ2/ جێناوی کەسی لکاوی (یان ، ن) لە دوو ڕستەدا بەکاربهێنە بەمەرجێك لە ڕستەی یەکەمدا (یان) بەرکار بێت ، (ن) بکەر بێت

وە لەڕستەی دووەمدا (یان) بکەر بێت و (ن) بەرکار بێت .

و/ 1=بیان بەن (بیان: بەرکار ، ن: بکەر) 2=ناردیانن (یان: بکەر ، ن: بەرکار)

پ3/ لە ڕستەی (خۆزگە دیتبێتتانی لە پێشانگاکە )

1= (تان ) چی یە ؟ ئەرکی چی یە ؟ 2= ئایا دەتوانین (ن) لە جیاتی (تان) بەکاربهێنین ؟ چۆن؟

3= کارەکە بکە بە ڕابردووی بەردەوامی ڕاگەیاندن ، چۆن جێناوی لکاو لەگەڵیدا دەبێتە بەرکار ؟

و/ 1= (تان) جێناوی لکاوە بۆ کەسی دووەمی کۆ ، ئەرکی بەرکارە .

2= بەڵی دەبێت بە (خۆزگە دیتبێتتنی لە پێشانگاکە).

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| 3= دەدیت / دەمی دیت | دەمانی دیت | یان | دەی دیتم | دەی دیتین |
| دەتی دیت | دەتانی دیت | | دەی دیتیت | دەی دیتن |
| دەیی دیت | دەیانی دیت | | دەی دیت | دەی دیتن |

# ئەرکی جێناوی لکاو لە دەوری تەواوکەری بەیاریدەدا

بۆ ئەرکی جێناوی لکاو لە دەوری تەواوکەری بەیاریدەدا مەرجە ئامرازی پەیوەندی (بۆ،پێ،لێ ،تێ) لەپێش کارەکەوە هەبێ .

کۆمەڵەی یەکەم (م – مان ، ت – تان ، ی – یان )

**1**= کاری ڕابردووی تێپەڕ :

ئەگەر بەرکار لەڕستەدا باس کرابێت ئەوا جێناوی لکاو وەك تەواوکەری بەیاریدە دەچێتە سەر ئامرازی پەیوەندی وەکو :

(زەوی یەکانی بۆمان کێڵا ) ، وەئەگەر بەرکار لە ڕستەکەدا لابرا بەمەبەستی کورتکردنەوە ، ئەوا جێناوی لکاوی بکەر دوای جیناوی لکاوی تەواوکەری بەیاریدە دیت ، وە دەبێتە : ( بۆمانی کێڵا )

**2**= کاری ڕانەبردووی تێپەڕ : جێناوەکان وەك تەواوکەری بەیاریدە دەچنە سەر بەرکار ئەگەر باسکرابێت ، وەکو :

(گوندەکەمان بۆ ئاوەدان دەکەنەوە ) ، بەلاّم ئەگەر بەرکار لابرا بەمەبەستی کورت کردنەوە ئەوا جێناوی (مان) دەچێتە سەر ئامرازی پەیوەندی بەم جۆرە : (بۆمان ئاوەدان دەکەنەوە )

تێبینی : هەندێ جار ئامرازو جێناوی لکاو وەك تەواوکەری بەیاریدە دەکەونە دوای کارەکەوە ، وەکو :

بۆمی دەنێریت ← دەی نێریت بۆم .

**3**= کاری ڕابردووی تێنەپەڕ : جێناوەکان دەچنە سەر بکەر ، وەکو :

دەرمانەکەم پێکەوت ، پارەکەیان لێکەوت ، ڕۆژنامەکەم بۆ هات ، بەلاّم ئەگەر بکەر لابرا بە مەبەستی کورتکردنەوە ئەوا جێناوەکان دەچنە سەر ئامرازی پەیوەندی بەم جۆرە :

پێم کەوت ، لێ یان کەوت ، بۆم هات .

**4**= کاری ڕانەبردووی تێنەپەڕ : جێناوەکان دەچنە سەر بکەر ، وەکو :

دەرمانەکەم پێ دەکەوێت ، هەواڵەکەیان پێ دەگات ، پارەکەت لێدەکەوێت ، بەلاّم ئەگەر بکەر لابرا ئەوا جێناوەکان دەچنە سەر ئامرازی پەیوەندی : پێم دەکەوێت ، پێ یان دەگات ، لێت دەکەوێت

5- کاری بکەر نادیار : جێناوەکان دەچنە سەر جێگری بکەر ، وەکو :

کارەکەم بۆ تەواوکرا ــ کارەکەم بۆ تەواودەکرێت ،دەفتەرەکەت لێ ستێنرا ــ دەفتەرکەت لێ دەستێنرێت

بەلاّم ئەگەر جێگری بکەر لابرا جێناوەکان دەچنە سەر ئامرازی پەیوەندی :

بۆم تەواوکرا ــ بۆم تەواودەکرێت ، لێت ستێنرا ــ لێت دەستێنرێت .

6- کاری ناتەواو : جێناوە لکاوەکانی (م-مان ....) کۆمەڵەی یەکەم دەبنە تەواوکەری بەیاریدە و دەچنە سەر نیهادی ڕستەکە بەمەرجێك ئامرازی پەیوەندی لە ڕستەکەدا هەبێت وەکو : ڕ1- ۆژنامەکەم پێبوو ، 2- خەلاّتەکەمان بۆ دەبێت ،3- هاوڕێکەت لێبوو بە دوژمن.

7- کاری داخوازی تێنەپەڕ : جێناوە لکاوەکانی (م-مان ،ی-یان) دەبن بە تەواوکەری بەیاریدە و ڕاستەوخۆ دەچنە سەر ئامرازی پەیوەندی وەکو : پێم بگەن ــ پێمان بگەن ، پێی بگەن ــ پێیان بگەن .

8- کاری داخوازی تێپەڕ : جێناوە لکاوەکانی (م – مان ،ی – یان ) دەبن بە تەواوکەری بەیاریدە و دەچنە سەر بەرکار ئەگەر باسکرا بێت وەکو : [ دارشتنەکەم بۆ بخوێنەرەوە – هەوالەکەیان پێ بلێ ]، بەلاّم ئەگەر بەرکار لابرا جێناوەکان دەچنە سەر ئامرازی پەیوەندی : بۆم بخوێنەرەوە – پێیان بلێ .

## - ن )

هەمیشە لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا دەبن بە تەواوکەری بەیاریدە و دەچنە سەر کۆتایی کارەکە ، وەکو :

پرسیارەکانی بۆم چاپ کرد----> بۆی چاپ کردم ، زەوییەکەمان لێ سەندن ----> لێمان سەندن

پ1/ کەی جێناوی کەسی سێیەمی تاك وەك تەواوکەری بەیاریدە دەرناکەوێت ؟

وە/ ئەگەر کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕ بێت و کۆمەلە جێناوی (م-ین) دەوری تەواوکەری بەیاریدەی گێڕابێت ئەوا جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك دەرناکەوێت چونکە نیمانە ،وەکو: گۆڤارەکەت لێ سەند ، بارەکەیان پێ هەلگرت ، کتێبەکەمان بۆچاپکرد .

پ2/ لە ڕستەی [ سێوەکەی بۆ هەلبژاردین ]

1- ئەرکی(ی)،(ین) چی یە ؟ بۆچی لەو شوێنەدان ؟

2- ئەگەر (بۆ) لابەرین ، ئەرکی (ین) دەبێتە چی ؟

3- ئەگەر (ین) بۆ (مان) بگۆڕین ، دەچێتە کوێ ؟ بۆچی ؟ ڕستەکەش بنووسەرەوە .

4- ئەگەر وشەی (سێوەکە) و ئامرازی (بۆ) لابەرین ، ئەوا (ی) دەچێتە کوێ ؟ بۆچی ؟ پاشان ئەرکی (ین) دەبێ بەچی ؟

وەلام/ 1- ئەرکی (ی) بکەرە چونکە بەرکار باس کراوە ، ئەرکی (ین) تەواوکەری بەیاریدەیە چونکە لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ دەچنە کۆتایی کارەکە

2-(ین) دەبێتە دیارخەری ناو

3-(مان) دەچێتە سەر ئامرازی پەیوەندی ، چونکە کۆمەڵە جێناوی لکاوی (م-مان) وەك تەواوکەری بەیاریدە لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ دەچنە سەر ئامرازی پەیوەندی.

4-(ی) دەچێتە دوای بەشی یەکەمی کارەکە ، چونکە کارەکە دارِژاوە ، پاشان (ین) دەبێتە بەرکار.

پ3/ وەلامی ڕاست هەلبژێرە

1- "چیرۆکەکەم بۆ بنوسەرەوە "لەم ڕستەیەدا جێناوی لکاوی "م" ئەرکی (بکەر ، تەواوکەری بەیاریدە، دیارخەری ناو)

2- "پارەکەی لێسەندین" لە ڕستەیەدا جێناوی لکاوی "ین" ئەرکی (بەرکار ، دیارخەری ناو ، تەواوکەری بەیاریدە)یە

3- (ڕاپۆرتەکەیان پێنوسیمەوە) لەم ڕستەیەدا جیناوی لکاوی "م" ئەرکی (تەواوکەری بەیاریدە، بەرکار ، دیارخەری ناو)ە.

پ4/لە ڕستەی (ولاتەکەیان لێدابەش کردین) ئەمانە دەربخە ؟ 1- ئەرکی (ین) چی یە ؟ بۆچی خراوەتە ئەو شوێنەوە؟

2- کارەکە لە ڕستەکە بگۆڕە بۆ کاری ڕانەبردووی ڕاگەیاندن؟ئینجا ئەرکی هەردوو جێناوی لکاوەکە دوای گۆڕانەکە بنووسە؟

و/ 1- ئەرکی (ین) تەواوکەری بەیاریدەیە چونکە کاری ڕستەکە ڕابردووی تێپەڕە.

2-ولاتەکەمان لێدابەش دەکەن ، مان : تەواوکەری بەیاریدەیە ، ن : بکەرە

## ئەرکی جێناوی کەسی لکاو لە ڕستەدا وەکو دیارخەری ناو

بۆ ئەرکی جێناوی لکاو لە دەوری دیارخەری ناودا :

1- دەبێت ناوێکی دیارخراو لە ڕستەکەدا هەبێت

2- ئەم بەدیارخستنە پێویستی بە (ی) ئامرازی خستنەسەر نابێت.

کۆمەلە جێناوی لکاوی یەکەم (م-مان،ت-تان،ی-یان) لەگەڵ ئەم کارانەی خوارەوەدا دەبنە دیارخەری ناو و هەمیشە دەچنە سەر ناوەکە، جا ئەگەر ناوە دیارخراوەکە بە ناوێك یان هاوەڵناوێك دەرخرابێت ئەوا جێناوە لکاوە دیارخەرەکە دەکەوێتە دوای دیارخەرەکانی ناوەکەوە

1- کاری ڕابردووی تێپەڕ :

ئەگەر دوو جێناوی لکاوی کۆمەڵەی (م-مان،ت-تان،ی-یان) چووە سەر بەرکارەکە ئەوا یەکەمیان دیارخەری ناوە و دووەمیان بکەرە،وەکو : نامەکەتم گەیاند ، گۆڤارە نوێیەکەمانیان خوێندووەتەوە .

دیارخەری ناو　بکەر　دیارخەری ناو　بکەر

خانووەکەمیان کڕی ، خانووە نوێیەکەمیان نەفرۆشتووە .

2- کاری ڕانەبردووی تێپەڕ : جێناوەکان دەچنە سەر بەرکار ، بکەریش دەچێتە کۆتایی کارەوە .

کتێبخانەی شارەکەمان نۆژەن دەکەنەوە ، خانووە خۆشەکەمان دەفرۆشین ، خوێندنگا کۆنەکەیان دەڕوخێنن.

دیارخەری ناو　بکەر　دیارخەری ناو　بکەر

3- کاری ڕابردووی تێنەپەڕ : جێناوەکان دەچنە سەر بکەر .

براکە مان ڕۆیشت بۆ شانۆگەرییەکە . براکە : بکەرە ، مان : دیارخەری ناوە .

خوێندکارەکانیان نەهاتونەتەوە . خوێندکارەکان : بکەرە ، یان : دیارخەری ناوە.

4- کاری ڕانەبردووی تێنەپەڕ : جێناوەکان دەچنە سەر بکەر

هاوڕێکە م دێت بۆ ئێرە. ، کرێچیەکە مان دەرناچێت .

بکەر　دیارخەری ناو　بکەر　دیارخەری ناو

5- کاری بکەر نادیار : جێناوەکان دەچنە سەر جێگری بکەر .

زیندانیەکانمان ئازادکران . ، زەوییەکە م دەکێڵرێت ، باخەکەتان فرۆشرا .

جێگری بکەر　دیارخەری ناو　جێگری بکەر　دیارخەری ناو

6- کاری ناتەواو : هەموو جێناوە لکاوەکانی (م-مان،ت-تان،ی-یان) دەبن بە دیارخەری ناو و دەچنە سەر نیهادی ڕستەکە وەکو

1- هەرێمەکەمان خۆش دەبێت　2- کوڕەکەتان ئەندازیار بوو .　3-ژوورەکەم ساردە.

7- کاری داخوازی تێپەڕ :

تەنها جێناوە لکاوەکانی (م-مان،ی-یان) دەبن بە دیارخەری ناو و لە دوای ناوێکەوە دێت یان بەرکارە یان تەواوکەری بەیاریدەیە، وەکو : پەیامەکە مان بگەیەنن بە هاولاتیان . ، لە کتێبەکە م بکرە .

بەرکار　دیارخەری ناو　ت.بەیاریدە　دیارخەری ناو

( ن -

ئەم کۆمەڵەیە هەمیشە لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕدا دەبن بە دیارخەری ناو و دەچنە سەر کۆتایی کارەکە ، وەکو :

نامەکەم گەیاندیت . م/ بکەرە ، یت / دیارخەری ناوە ، پێنووسە ڕەشەکەی بردین . ی/ بکەرە ، ین / دیارخەری ناوە

- ن ) دەوری دیارخەری ناوی گێڕابێت ، ئەوا جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك وەك دیارخەری ناو دەرناکەوێت ، وەکو :

پەیامەکەمان گەیاند . ، دیاری یەکەی وەرگرت . ، خانووەکەی سەرگرت .

2) ئەگەر ناوێکی دیارخراو بە ناوێك یان چەند ناوێك دیارخرا ئەوا جێناوی لکاوی دیارخەر لەدوای هەموو دیارخەرەکانەوە دێت ، وەکو : ئاوی کانییەکانی چیاکانی وڵاتەکەمان کەمی کردووە .

3) ئەگەر جێناوی کەسی لکاو بوو بە دیارخەری ناوێك ئەوا هیچ وشەیەکی تر نابێت بەدیارخەری ناوەکە چونکە دەبێتە هۆی تێکچوونی دارشتنی ڕستەکە و شێواندنی واتاکەی ، بۆ نمونە ناتوانین بڵێین :

1- پەنجەرەکەمان خانووەکە گەورەیە . 2- مامۆستاکەیان کوردی نەهاتووە .

4) ئەگەر هاوەڵناوێك بوو بە دیارخەری ناوەکە پاشان جێناوی کەسی لکاو بوو بە دیارخەری ، ئەوا ناوەکە و هاوەڵناوەکە دەخرێتە شێوەی ناوێکی لێکدراوەوە و پاشان جێناوە لکاوەکە دەبێتە دیارخەری، وەکو :

1- پەنجەرەشکاوەکەمان فڕێ دایت . 2- نەمامە بچوکەکەیان هەڵمەکێشن .

5) ناوە دیارخراوەکە و جێناوە کەسییە دیارخەرەکە وەکو گرێیەکی ناوی دەتوانن هەموو ئەرکەکانی ناو ببینن لە ڕستەدا ، وەکو : 1- نیهاد : هاوڕێکەم زیرەکە . 2- بکەر : هاوڕێکەم هات . 3- بەرکار : هاوڕێکەمیان بینی . ....هتد .

پ1/ لە ڕستەی ( خانووە نوێیەکەمانی فرۆشت )

1- (ی) چی یە ؟ ئەرکی چی یە ؟

و/ (ی) جێناوی لکاوە بۆ کەسی سێیەمی تاك ، ئەرکی بکەرە.

2- ئەرکی (مان) چی یە ؟ بۆچی لەو شوێنەدایە؟

و/ ئەرکی "مان" دیارخەری ناوە چونکە کارەکە ڕابردووی تێپەڕە ، (مان) لە کۆمەڵە جێناوی لکاوی یەکەمە (م=مان،ت=تان،ی=یان) ڕاستەوخۆ دەچنە سەر بەرکار ٠

3= ئەگەر لەبری (مان)،(ین) بەکاربهێنین دەچێتە کوێ ؟ بۆچی ؟

=ن) لەگەڵ کاری ڕابردووی تێپەڕ وەك دیارخەری ناو دەچنە کۆتایی کار٠

4= (ە) ی دوای وشەی خانوو چی یە ؟ و/ (ە) ئامرازی دانە پاڵە٠

5= کاری ڕستەکە بگۆڕە بۆ شێوازی ڕابردووی نزیکی دانانی و ڕستەکە بنووسەرەوە ٠

و/ بریا خانووە نوێیەکەمانی فرۆشتبا ٠

پ2/ وەلامی ڕاست هەلبژێرە ؛

1= لە ڕستەی (منالەکەی ونبوو) جێناوی لکاوی (ی) ئەرکی (بکەر ، بەرکار، دیارخەری ناو)

2= لە ڕستەی (مامۆستاکان تواناکانیان پەرەپێدەدەن) جێناوی لکاوی(یان) ئەرکی (دیارخەری ناو ، بکەر ، بەرکارە )

3= لە ڕستەی (چیرۆکەکەت بخوێنەوە) جێناوی لکاوی(ت)ئەرکی (بکەر ، دیارخەری ناو ، بەرکار) ە٠

## جێناوی سەربەخۆ لە دەوری دیارخەری ناودا

بۆئەوەی جێناوی سەربەخۆ ببێتە دیارخەری ناوێك ، مەرجە ؛

1= ناوە دیارخراوەکە پێش جێناوی سەربەخۆی دیارخەربکەوێت ٠

2= ئامرازی خستنەسەری (ی) بکەوێتە نێوانیان ٠

3= ناوی دیارخراو و جێناوی دیارخەر پێکەوە گرێیەکی ناوی دروست دەکەن و دەتوانن هەموو ئەرکەکانی ناو دەبینن ٠

ئەو جێناوە سەربەخۆیانەی کەدەبنە دیارخەری ناو ئەمانەن ؛

1= جێناوی کەسی سەربەخۆ ؛ (من –ئێمە، تۆ – ئێوە ، ئەو – ئەوان) وەکو ؛

خەلاتەکەی من بەنرخ بوو ٠ خەلاتەکەی من ؛ ئەرکەکەی نیهادە

2= جێناوی خۆیی ؛ (خۆم – خۆمان ، خۆت – خۆتان ، خۆی – خۆیان) وەکو ؛

خانووەکەی خۆتم پێ بفرۆشە ٠ خانوەکەی خۆت ؛ ئەرکەکەی بەرکارە

3= جێناوی پرس ؛ (کێ ، چی ، کامە ٠٠٠٠) وەکو ؛

چیرۆکی کێ خوێنرایەوە ۔ چیرۆکی کێ : ئەکەکەی جێگیری بکەرە ۔

4– جێناوی نیشانە : (ئەمە ، ئەمانە ،ئەوە ،ئەوانە ) وەکو :

تاقیکردنەوەکەم لە تاقیگەی ئەمانە ئەنجام دا۔ تاقیگەی ئەمانە : تەواوکەری بەیاریدەیە

5– جێناوی نادیار : ( کەس ، فلان ، فیسار ، هین ،کابرا ۔۔۔۔) وەکو :

ئەمە کۆمپیوتەرەکەی کابرا بوو ۔ کۆمپیوتەرەکەی کابرا : تەواوکەری کاری ناتەواوە ۔

تێبینی : 1) لەشێوەزاری کرمانجی سەروودا جێناوە کەسی یە سەربەخۆکانی (من – مە ، تە – وە ، وی /وێ – وان ) وەکو دیارخەری ناو بەکاردێن ، وەکو : وەلاتی مە خۆشە ، کورێ تە هات۔

2)جێناوی هەیی نابێت بە دیارخەری ناو چونکەتەنها ئەرکی دیارخراو دەبینێت و نابێت بە دیارخەر ۔

پ1/ لە ڕستەی (مامۆستای ئەوانە خەلاتکراوە) 1– (ئەوانە) چی یە و ئەرکی چی یە ؟ 2– ڕستەکە بنوسەرەوە بەمەرجێ لە شوێنی (ئەوانە) جارێك هاوەڵکاری پرس و جارێك هاوەڵناوی نیشانە دابنێ ؟

و/ 1– (ئەوانە) جێناوی سەربەخۆیە و دیارخەری ناوە۔

2– کام مامۆستا خەلاتکراوە ، ئەم مامۆستایە خەلاتکراوە ۔

پ2/ لە ڕستەی (ئێمە بۆ وڵاتی خۆمان تێدەکۆشین): 1– (خۆمان) چی یە و ئەرکی چی یە ؟ 2– لەم ڕستەیە لە شوێنی وشەی (خۆمان)جارێك "هاوەڵناوی نیشانە" و جارێك "ناوێکی تر" دابنێ ۔

و/ 1– خۆمان : جێناوی خۆییە و دیارخەری ناوە ۔ 2– ئێمە بۆ ئەم وڵاتە تێدەکۆشین ، ئێمە بۆ وڵاتی کوردستان تێدەکۆشین۔

## کاری چاوگی (بوون)

کاری ناتەواو : ئەو کارەیە کە بەتەنها ناتوانێت واتای ڕستەکە تەواو بکات ، بەڵکو پێویستی بە وشەیەك یان بەشێکی تر هەیە

کەواتاکەی تەواوبکات ، کەپێی دەوترێت تەواوکەری کاری ناتەواو .

❀ کاری ناتەواو لە چاوگی بوون وەردەگیرێ و لەڕووی دەمەوە دەکرێت بە :

1- دەمی ڕابردوو (بوو) : ئەوە ئارام بوو . هاوڕێ خوێندکار بوو .

2- دەمی ڕانەبردوو (ە) بۆ دەمی ئێستا : کتێبخانەکە دوورە . سەیرانگاکە خۆشە .

3- دەمی داهاتوو (دەبێت) : کاوە دەبێت بە مامۆستا . ، ئەمان دەبن بە ئەندازیار .

پ1/ کاری ناتەواو بەچی و چۆن تەواو دەکرێت ؟

وەلام /

1- ناو : ئەمە ئارامە . ڕۆژنامەکە بە ئارام بوو .

2- ئاوەڵناو : خانووەکە خۆشە . هەنارەکە ترش بوو .

3- چاوگ : هیوامان سەرکەوتنە پێشکەوتنمان بە خوێندنە .

4- ئاوەڵکار : شانۆگەرییەکە ئێوارەیە . ئاهەنگەکە بە شەو بوو .

5- جێناو : ئەوە من بووم لەپۆلەکەدا . گۆڤارەکە بە من دەبێت .

پ2/ ئەو جێناوە سەربەخۆیانە کامانەن کە دەبن بەتەواوکەری کاری ناتەواو ؟

وەلام/ 1- جێناوی کەسی سەربەخۆ : ئەوە من بووم لەپۆلەکەدا . ڕۆمانەکە بە ئەوانە .

2- جێناوی خۆیی : ئەوە خۆم بوو لە باخەکەدا . پارەکە بە خۆیان دەبێت .

3- جێناوی پرس : ئەوە کێ بوو ؟ ڕۆژنامەکە بە کێ یە ؟

4- جێناوی نادیار : ئەوە فلانە . تۆپەکە بەکابرا دەبێت .

5- جێناوی نیشانە : ئەمە بوو خەلات کرا . ڕاپۆرتەکە بە ئەمانەیە .

پ3 / کەی کاری ناتەواو بۆ دەمی ئێستا (ە) دەرناکەوێت ؟ کەی دەردەکەوێت ؟

- ن ) دیار و ئاشکرابن ، وەکو :

- ئەوان خوێندکارن

﴿ نیمانە لە کۆمەڵەی دووەم لەبری ئەوە کاری ناتەواو بۆ دەمی ئێستا دەردەکەوێت ، وەکو : ﴿ ئەو خوێندکارە﴾ .

**تێبینی** : کاری ناتەواو بەم شێوەیە نەرێ دەکرێت :

1) ﴿بوو﴾ بە ئامرازی ﴿نە﴾ نەرێ دەکرێ ، وەکو : خوێندکارەکە زیرەك نەبوو .

2) ﴿ە﴾ ڕانەبردوو بۆ دەمی ئێستا بە ﴿نی﴾ نەرێ دەکرێ ، وەکو : باخچەکە بچووك نی یە .

3) ﴿دەبێت﴾ ڕانەبردوو بۆ دەمی ئێستا بە ﴿نا﴾ نەرێ دەکرێ ، وەکو : ئارۆ نابێت بە مامۆستا .

پ1 / کەی کاری چاوگی ﴿بوون﴾ دەبێت بە کاری تەواوی تێپەڕ لە ڕستەدا ؟

وەلام / 1- ئەگەر بەواتای خاوەنداریێتی هات ، ئەوا :

پارەم هەبوو . ﴿هەمبوو﴾ ⇓ کاریڕابردووی تەواوی تێپەڕە بۆ دەمی ڕابردوو .

پارەم هەیە . ﴿هەمە﴾ ⇓ کاری ڕانەبردووی تەواوی تێپەڕە بۆ دەمی ئێستا .

پارەم دەبێت . ﴿دەمبێت﴾ ⇓ کاری ڕانەبردووی تێپەڕ بۆ دەمی داهاتوو .

2- ئەگەر بەواتای لەدایك بوون هات کاری ﴿بوو،دەبێت﴾ :

نازەنین منالی نەبوو . ژنەکە مندالی بوو . ⇓ کاری ﴿بوو﴾ ڕابردووی تەواوی تێپەڕە .

شیرین مندالی نابێت . شیرین مندالی دەبێت . ⇓ کاری ڕانەبردووی تەواوی تێپەڕە .

پ2/ کەی چاوگی ﴿بوون﴾ دەبێتە کارێکی تەواوی تێنەپەڕ؟

وەلام / أ- ئەگەر بەواتای ﴿بوون = وجود﴾ هات ، وەکو :

1- من هەبووم لە پۆلەکەدا .　　　2- أ.من دەبم لە کۆڕەکەدا . ب. بەیانی ئارام لە کۆڕەکە دەبێت

3- من هەم لە شانۆگەرییەکەدا .

ب- بە شێوەیەکی گشتی پێشگر یان وشەیەکی واتادار کە ببێتە بەشێك لە کارەکە ، دەچنە پێش کارەکە و ئەوا دەبن بە کارێکی تەواوی تێنەپەڕی دارژاو یان لێکدراو :

1- من هەم لە ئاهەنگەکەدا . 2- بۆیلەرکە هەڵە . 3- ئارام بەردەوامە لەسەر خوێندنەکەی.

وەکو : چراکە هەڵبوو . ( ڕابردوو ) . چراکە هەڵدەبێت . (ڕانەبردوو)

کاوە سوور بوو لەسەر داواکەی . (ڕابردوو) کاوە سوور دەبێت لەسەر داواکەی.(ڕانەبردوو)

کاری ڕابردووی تەواوی تێنەپەڕی لێکدراوە کاری ڕانەبردووی تەواوی تێنەپەڕی لیکدراوە

تێبینی : پێویستە کاری ناتەواو بۆ دەمی ڕابردوو (بوو) لەمانە جیابکەینەوە :

1- هۆنراوەکەم نووسیبوو . (نیشانەی کاری ڕابردووی دووری ڕاگەیاندن)

2- دەبوو سەرتان لێ بدەم . کاری یاریدەدەر ، هەروەها ئەمانەش (نەدەبوو ،دەبوایە ، نەدەبوایە ...)

پێویستە کاری یاریدەدەری (دەبێت) لە کاری ناتەواو جیابکەینەوە ، وەکو : دەبێت سەربکەوین.(کاری یاریدەدەر)

---

## ئەرکی بزوێن (ە) لە ڕێزمانی کوردیدا

1- دەبێتە کاری ناتەواو بۆدەمی ئێستا لە ڕستەی سادەدا ، ئەگەر کاری سەرەکی لە ڕستەدا نەبوو:وەکو

یەکی ئایار جەژنی کرێکارانە . ئەوە ئارامە . هیوامان سەرکەوتنە .

2- دەبێتە جێناوی لکاو بۆ کەسی دووەمی تاك لەگەڵ کاری داخوازیدا ئەرکی بکەر دەبینێت ، وەکو :

بخوێنە تا دەربچیت . تێبکۆشە . سەرمایەکە بەدەست بهێنە .

3- دەبێتە ئامرازی پەیوەندی : دەلکێت بە کۆتایی کاری ڕابردوو ، ڕانەبردوو ، داخوازی ، جێگای ئامرازی (بۆ- بە) دەگرێتەوە :

وەکو : أ- کاری ڕابردوو : ( کاوە هاتە لامان ). ب- کاری ڕانەبردوو : (ئارۆ دەبێتە ئەندازیار)

ج- کاری داخوازی : ( ئێوە بڕۆنە دەرێ )

4- دەبێتە ئامرازی بانگکردن : ئەگەر بەدوای ناودا هات و کاری ڕستەکە داخوازی بوو ، وەکو :

کاکە وەرە ، کورە بخوێنە، براینە تێبکۆشن ،

5- دەبێتە (پاشگر) بۆ دروست کردنی وشەی نوێ ،وەکو :

أ- ناو : دەست ⇓ دەستە ، ب- هاوەڵناو : سەوز ⇓ سەوزە ، ج- ڕەگی کار : پرس ⇓ پرسە ، د-

د- قەدی کار : کرد ⇓ کردە ، ⇓ ئەوە هاوەڵناوی کراوی دارێژراوە ،

6- دەبێتە ئامرازی پێناسین ، کە کورت کراوەی (ەکە) ی ناساندنە ، وەکو :

ژنە هەژار بوو ، بۆیە دەگریا ، کورە هات ،

7- دەبێتە ئامرازی لێکدەر بۆ دروست کردنی وشەی لێکدراو ، وەکو :

ڕەشەبای سلێمانی بەناوبانگە ، گوڵە گەنمەکان کۆدەکەمەوە ،

8- دەبێتە جێناوی لکاو بۆ کەسی سێیەمی تاك لەگەڵ کاری ڕانەبردوو لە کرمانجی ژووروودا ، وەکو :

ئەو دکەڤە ، ئەو چیرۆکی دنڤیسە ،

9- دەبێتە ئامرازی دانەپاڵ و گرێی ناوی دروست دەکات لەو کاتەی کە لەنێوان ناوێکی ناسراو ، دیارخراو بە هاوەڵناوی چۆنیەتی دێت ، وەکو : 1- مەرە لاوازەکەم فرۆشت ، هەنارە مزرەکەم خوارد ،

پ1/ ئەرکی بزوێنی کورت (ە) لەمانەی خوارەوە چییە ؟

1- کورە ، بخوێنە ، نمرە بەرزەکەبەدەس بهێنە ،

کورە : ئامرازی بانگکردنە ، بخوێنە : جێناوی لکاوی بکەرە ، نمرە : بەشێکە لە ناوەکە ، بهێنە : جێناوی لکاوی بکەرە،

2- جۆری کار لەمانەی خوارەوە دیاری بکە؟

1- هەمووومان کۆبوینەوە 2- سەیرانگاکان خۆشن ، 3- ئەوە من بووم لە شانۆگەریەکەدا ،

3- کاکە ئەوە تەختە کۆنەکەیە ، هەرکاتێ هێناتە خوارەوە ، بیسووتێنە ،

کاکە : ئامرازی بانگکردنە ، تەختە : ئامرازی دانەپالە ، کۆنەکەیە : کاری ڕانەبردووی ناتەواوە،

هێناتە : ئامرازی پەیوەندی یە ، بیسووتێنە : جێناوی لکاوی بکەرە ،

پ2 / ئەرکی (بوو) لەمانەی خوارەوە چی یە ؟

1- ئەوە خوێندکارەکە بوو ، 2- کە خاوەن نمرەیەکی زۆر بوو ، 3- لێرە دانیشبوو ، 4-لە ناکاو وون بوو،

1- بوو : کاری ڕابردووی ناتەواوە ، 2- زۆربوو : کاری ڕابردووی تەواوی تێپەڕە ،

3- دانیشتبوو : نیشانەی ڕابردووی دوورە. 4- وون بوو : کاری ڕابردووی تەواوی تێنەپەڕە .

---

## هاوەڵناو لەڕووی دروست بوونەوە

هاوەڵناو : وشەیەکە وەسفی ناوێك یان جێناوێك دەكات ، ئاوەڵناو وشەیەکە دەبێتە :

1- دیارخەری ناوێك : خوێندکاری زیرەك دەردەچێت .

2- دیارخەری جێناوێك : ئێمەی ئازا لە دوژمن ناترسین .

3- دیارخەری هاوەڵناوێکی تر : خوێندکارەکە زۆر زیرەك بوو .

4- تەواوکەری کاری ناتەواو : پەککەوتەکە هەژارە .

هاوەڵناو لەڕووی چۆنیەتی دروست بوونی وشەکانیەوە ، دوو جۆرە :

أ- هاوەڵناوی سادە ، ب- هاوەڵناوی ناسادە .

أ- هاوەڵناوی سادە : لە وشەیەکی واتاداری سەربەخۆ پێك دێت . وەکو :

باش ، جوان ، خراپ ، توند ، سارد ، گەرم ، ڕەش ، نەرم ....

ب- هاوەڵناوی ناسادە : ئەمیش دوو جۆرە ( دارژاو ، لێکدراو )

1- هاوەڵناوی دارژاو : لە وشەیەکی واتادار و (پێشگر یان پاشگر) ێك یان لەگەڵ هەردووکیان پێك دێت ، بەم شێوەیە :

1- هاوەڵناوی سادە + پاشگر : وەکو / یەکەم ، ڕووناك ، نەرمان ، ڕەقەن .

2- پێشگر + هاوەڵناوی سادە : وەکو / نەخۆش ، نارێك ، نارەسەن ، ناشرین ، ناڕاست .

3- ناوی سادە + پاشگر : وەکو / ژنانە ، زێڕین ، بریندار ، گۆشتن ، ڕاوچی ، دەشتەکی ، بەختیار ، ئاسنگەر.

4- پێشگر + ناوی سادە : وەکو/ بەتام ، بێ شەرم ، بێ نەوا ، بێ بەرگ ، بە جەرگ .

5- ڕەگی کار + پاشگر : وەکو / نووسەر ، گەڕۆك ،ترسنۆك ، فرۆشیار ، ترسناك ، زانا ، توانا ، خوێنەر ، هێنراو ، داهێنەر.

6- پێشگر +ڕەگی کار : وەکو / نەگۆڕ ، نەزان ، نەبەز ، لێ زان ، بکوژ ، ببڕ .

7- پێشگر + ڕەگی کار + پاشگر : وەکو / نا بینا = نا + بین + ا ، نەزۆك = نە + زێ + ۆك ، بخۆر = ب + خۆ + ر .

8- قەدی چاوگ + پاشگر : وەکو / کەوتوو ، شکاو ، سوتاو ، ڕزیوە ، بردە ، کەوتە ، لکاو ، خەوتوو ، نوستوو .

9- لە کرمانجی ژووروودا / قەدی چاوگ + پاشگری (ی) : وەکو / کەفتی ، شکەستی ، سۆتی ، شویشتی .

10- هاوەڵکاری سادە + پاشگر : وەکو / زۆردار ، کەس دار ، دەسەڵاتدار

2- هاوەڵناوی لێکدراو : بریتی یە لەو هاوەڵناوەی کە لە دوو وشەی واتادار یان زیاتر پێك دێت ، بەم شێوەیەی خوارەوە :

1- ناو + ناو : چاوباز ، بەژن چنار ، گەنم ڕەنگ .

2- ناز + ئامراز + ناو : دەست بەسەر ، ڕوو بەخاڵ ، گوڵ بەدەم ، لێوبەبار .

3- دووبارەکردنەوەی ناو : ڕی ڕێ ، چین چین ، پارچە پارچە ، کۆمەڵ کۆمەڵ ، پۆل پۆل .

4- ناو + هاوەڵناو : باڵابەرز ، دڵخۆش ، باڵاکورت ، قسەخۆش ، چاوچنۆك .

5- ناو + هاوەڵناوی کراو : دڵ سووتاو ، دڵ ڕەنجاو ، ماڵ سووتاو ، سەر شکاو.

6- ناو + ڕەگی کار : جەرگ بڕ ، قورئان خوێن ، ئاوکێش ، دەست بڕ ، خێرخواز ، ڕەخنەگر ، سەرتاش ، مێرکوژ ،ڕۆژنامەنووس.

7- ناو + ڕەگی کار + پاشگر : سوالکەر ، نامەبەر ، خەبات کەر ، ڕەنجدەر ، جل شۆر .

8- هاوەڵناوی ژمارەیی + ناو : حەوت ڕەنگ ، دوو دڵ ، یەك جار ، یەك کەڕەت .

9- هاوەڵناو + ئامراز + ناو : پیرەژن ، کورتە باڵا ، شۆڕەژن .

10- هاوەڵناو + ئامراز + هاوەڵناو : سور و سپی ، کەڕ و لاڵ ، پاك و خاوێن ، بۆرەدەولەمەند .

11- هاوەڵناو + و + وشەیەکی بێ واتا : نەرم و نۆڵ ، هار و هاج ، گورج و گۆڵ ، تاریك و نوتەك .

12- هاوەڵناو + ڕەگی کار : خۆش نووس ، گەش بین ، دووربین ، ڕاست بێژ ، ڕەش پۆش .

13- هاوەڵکار+ ناو : ژێردەست ، ژێرچەپۆك ، بن دەست ، ژێرپیالە .

14- دووبارەکردنەوەی هاوەڵناو : خۆش خۆش ، جوان جوان ، سور سور .

15- هاوەڵناو + ناو : وەکو / خۆش ڕوو ، زل هێز ، خۆش باوەڕ

16- هاوەڵکار + ڕەگی کار + پاشگر : وەکو / کەمخۆر ، زۆرخۆر

پ1 / جۆرو چۆنیەتی دروست بوونی ئەم هاوەڵناوانە چی یە ؟

وەلام / چاوکاڵ ⇓ ناسادە (لێکدراو) ، ناو + هاوەڵناو ( چاو +کاڵ)

ڕاستگۆ ⇓ ناسادە ( لێکدراو ) ، هاوەڵناو + ڕەگی کار ( ڕاست + گۆ)

نەمر ⇓ ناسادە (دارڕژاو) ، پێشگر + ڕەگی کار ( نە +مر)

سازگار ⇓ ناسادە (دارڕژاو) ، ناو + پاشگر ( ساز +گار)

چین چین ⇓ ناسادە (لێکدراو) ، دووبارەکردنەوەی ناوێك ( چین +چین )

## ئەرکی هاوەڵناو لە ڕستەدا وەکو دیارخەری ناو

هاوەڵناو بەم جۆرەی خوارەوە دەبێتە دیارخەری ناو :

هاوەڵناو چۆنێتی ( سادە، دارڕژاو ، لێکدراو) بێت ، دەبێتە دیارخەر بەچەند مەرجێك دەدرێتە پاڵ ناو :

1- ئەگەر ناوە دیارخراوەکە ،ناوێکی گشتی نەناسراو یان ناوێکی تاکی نەناسراو بێت ، هاوەڵناوێك ببێتە دیارخەری ئەوا پێویستە (ی) ئامرازی خستنەسەر بخەیتە نێوان ناوەکە و هاوەڵناوەکەوە . وەکو :

زێڕی پاك ژەنگ هەڵناهێنێت . نوێنەرێکی بە توانامان هەڵبژارد .

هۆنراوەی جوان دەنووسم . قوتابییەکی زیرەکم خەڵات کرد.

2- ئەگەر ناوە دیارخراوەکە ناوێکی ( تاك یان کۆی ناسراو ) بوو ، کاتێك هاوەڵناوێك دەبێتە دیارخەری ، ئەوا پێویستە :

أ- ناوەکە و هاوەڵناوەکە بخەینە سەر شێوەی ناوێکی لێکدراوەوە .

ب- نیشانەی تاك یان کۆی ناسراو دەخرێتە دوای هاوەڵناوەکەوە.

ج- یەکێك لەم دوو یاسایە بەکاردێت بۆ لێکدانی ناوەکە و هاوەڵناوەکە :

1- ئەگەر ناوەکە بە پیتێکی نەبزوێن کۆتایی هاتبوو ئەوا ئامرازی دانەپاڵی (ە) دەکەوێتە نێوانیانەوە ،وەکو:

ئەندازیارە بەتواناکە نەخشەی تەلارەکەی کێشا . درەختە بەرزەکان سیمایەکی جوان بەژینگە دەبەخشن.

2- ئەگەر ناوە دیارخراوەکە (تاك یان کۆی ناسراو ) بێت بەیەکێك لەم پیتە بزوێنانە (ە،ا،ۆ،ێ) دوایی هاتبێت و لە بڕگەیەك زیاتربێت ، بەپێی دەستوری بڕگە نابێت دوو بزوێن لەیەك بڕگەدا هەبن ، ئەوا ئامرازی خستنەسەری (ە)

لادەبەین ، وەکو ؛ ڕۆژنامە نوێیەکە کەوتە بازاڕەوە ۔　　ماموٚستا پێش کەوتووەکان خەلاّت کران ۔

هەلوٚ بەرزەکان نانیشنەوە ۔　　هەرمێ جوانەکە بکڕە ۔

تێبینی ؛ ئەگەر ناوە دیارخراوەکە لەبڕگەیەك پێکهاتبێت و هاوەڵناوێك ببێت بە دیارخەری ، ئەوا ئامرازی (ە) ی خستنەسەر بە یارمەتی ناوبەندی (ی) ی نەبزوێن دەچێتە نێوان پیتە بزوێنی ناوەکە و ئامرازە خستنەسەرەکە وەکو ؛

شەیە بچوکەکە بکڕە ۔　　بایە بەهێزەکە هەلی کرد۔　　دێیە خوٚشەکەم بینیوە ۔　　دوٚیە ترشەکەی ڕوٚکرد ۔

تێبینی ؛ئەگەر ناوە دیارخراوەکە لەیەك بڕگە پێکهات ئەوا دەگونجێت ئامرازی خستنەسەر نەکەوێتە نێوانیان ، وەکو ؛

**1**– شە بچووکەکە بکڕە ۔　**2**– لە سە دڕەکە مەترسە ۔ (سە = سەگ)

*ئەگەر ناوە دیارخراوەکە بە یەکێك لەم پیتە بزوێنانە (ی،وو) کوٚتایی هاتبوو ئەوا پێویستە پیتێکی نەبزوێن کە بگونجێت لەگەڵیاندا بخەینە نێوان بزوێنی وشەکە و ئامرازەکەوە ، بوٚیەکەمیان (ی) و بوٚ دووەمیان (و) ی بوٚ دادەنێین ، (وو) دەگوٚڕین بوٚ (و)

وەکو ؛ لە کانییە ساردەکە ئاو دەخوٚم ۔　　شاتووە سوورەکەم خوارد ۔

پ/ ئەو هاوەڵناوە دیارخەرانە کامانەن کە دەکەونە پێش ناوە دیارخراوەکەوە پێویستیان بە (ی) ئامرازی خستنەسەر نییە؟

وەلاّم / **1**–　هاوەڵناوی ژمارەیی (بنجی ، تەرتیبی ) ؛

بنجی ؛ یەك ڕوٚژنامەم کڕی ۔　　تەرتیبی ؛ یەکەمین خوێندکار خەلاّت کرا ۔

**2**–　هاوەڵناوی نیشانە (ئەم–ە ، ئەو –ە) ؛ ئەم زانکوٚیە پێشکەوتووە ۔

**3**–　هاوەڵناوی پرس (کام ، چ ، چوٚن ) ؛ کام یاریزان ئامادە نەبوو ۔

**4**–　هاوەڵناوی نادیار (هەموو ، زوٚر ، هەر ، هیچ ، هەندێك ) ؛ ڕوٚژگار هەموو مروٚڤێك دەردەخات ۔

**5**–　هاوەڵناو لە پلەی بالاّدا (گەورەترین ، جوانترین ، بەرزترین ) ؛ بەرزترین چیا لە جیهاندا هیمالایایە ۔

پ / ئەو هاوەڵناوانەی کە بەیاریدەی ئامرازی خستنەسەری (ی) دەبن بەدیارخەری ناو کامانەن ؟

**1**– هاوەڵناوی ژمارەیی ڕێکخستن ؛ ڕوٚمانی چوارەمینم کڕی ۔

2- هاوەڵناوی پرس (چۆن) : گوڵی چۆنت دەوێت ؟

3- هاوەڵناوی نادیار ( تر ، کە ، دیکە، زۆر) : فەرهەنگێکی تر بەکاردەهێنم .

4- هاوەڵناوی پلەی بەراورد (باشتر ، جوانتر) : نامەیەکی ڕازاوەتری نارد .

5- هاوەڵناوی ژمارەیی کەرتی : چواریەکی باخەکەم کێڵاوە.

پ/ لە ڕستەی ( هۆنراوە نوێیەکان جوانن) : 1- لە نێوان (هۆنراوە ، نوێیەکان) چی ئامرازێك بەکارنەهاتووە ؟ بۆچی؟

و/ ئامرازی دانەپاڵی (ە)بەکارنەهاتووە ، چونکە وشەی هۆنراوە (ناسراوە ، زیاتر لە برگەیەکە ، کۆتایی بە بزوێن هاتووە)

2-ناوێکی تر بهێنە بەهەمان بزوێنی (ە) کۆتایی هاتبێت و ئامرازە دانەپاڵەکە بەکارهاتبێ؟

و/ شەیە بچوکەکە بکرە .

3- کوا کاری ئەم ڕستەیە؟ بۆچی؟

و/ کاری ڕانەبردووی ناتەواوی (جوانن) کاتی ئێستا "ە" دەرنەکەوتووە ، چونکە جێناوە لکاوەکە دیار و ئاشکرایە .

تێبینی: 1) ناوی دیارخراو و هاوەڵناوی دیارخەر وەك گرێیەکی ناوی دەتوانن هەموو ئەرکەکانی ناو ببینن ، وەکو :

خوێندکارە زیرەکەکەم بینی . (بەرکارە)

2) دەشێت چەند هاوەڵناوێکی یەك لەدوای یەك ببن بە دیارخەری ناوێك / وەکو : ئەندازیارە چاکە بەتواناکە هاتووە .

## ناو لە دەوری دیارخەری ناودا

ئەگەر ناوێکی (دیارخراو) هەبوو ،(دیارخەرێك) یان چەند دیارخەرێك بدرێتە پالی ئەوا :

1- ناوی دیارخراو پێش ناوی دیارخەر دەکەوێت .

2- (ی) ئامرازی خستنەسەر دەکەوێتە نێوانیانەوە .

3- دەتوانین ناوە دیارخراوەکە یان دیارخەرەکەی یان هەردووکیان بەپێی شوێن و مەبەست بەمەرجێك لەگەڵ ڕاستیدا بگونجێت لەشێوەی (تاك و کۆ ، ناسراو و نەناسراو) دا لەناو ڕستەدا بەکاربهێنین ، وەکو :

دەرگای ژوورەکە کراوەتەوە . دەرگا : دیارخراوە . ی : ئاخستنە سەرە . ژوورەکە : دیارخەرە . کراوەتەوە : کارە

هەروەها ئەوە ڕوون دەبێتەوە کە لە پەیوەندی نێوان دیارخراو و دیارخەردا خاوەنێتی و ناسیاوی و تایبەتمەندیتی دروست دەبێت .

تێبینی : ناوی دیارخراو دەتوانێت چەند ناوێکی یەك لە دوای یەکی دیارخەر وەربگرێت ، وەکو :

ڕەنگی جلەکانی منداڵانی باخچەکانی ساوایانی کوردستان جوانن .

وە دەتوانین ناوی دیارخراو یان دیارخەرەکەی بە ئاوەڵناوی نیشانە دەست نیشان بـکەین ،بۆیە پێی دەوترێ ناوی دەست نیشان کراو .

1- ئەم تابلۆیەی ئارۆ جوانە . (ناوێکی تایبەتی دیارخەری ناوێکی دەست نیشانکراوی دیارخراو)

ئەم ______ ە : ئاوەڵناوی نیشانەیە دیارخەرە . تابلۆ : ناوە ، دیارخراوە.

2- خانووەکانی ئەم شارە جوانن . (ناوێکی دەست نیشان کراو دیارخەری ناوێکی کۆی ناسراوە ) شار : ناوی دەست نیشانکراو.

پ/ ئایا دروستە بڵێین (دلەکانی پیاوە بەتەمەنەکە نەخۆشە )

وە/ نەخێر چونکە لەگەڵ ڕاستیدا ناگونجێت ،دەبێت بڵێین :دلی پیاوە بەتەمەنەکە نەخۆشە .

هەندێك نمونەی ڕستەی بۆ ئەم داواکاریانەی خوارەوە :

1- ناوێکی تایبەتی دیارخەری ناوێکی کۆی ناسراو بێت ، وەکو :

( دێهاتەکانی کوردستان ئاوەدان کرانەوە ) (باخچەکانی سلێمانی جوانن)

2- ناوێکی تاکی ناسراو دیارخەری ناوێکی کۆی ناسراو بێت ،

وەکو ؛ ﴿ تابلۆکانی ژوورەکەم لێکردۆتەوە ﴾ ﴿خوێندکارەکانی پۆلەکەم ڕەوشت بەرزن﴾

3- ناوێکی گشتی دیارخەری ناوێکی تاکی نەناسراو بێت ،

وەکو ؛ ﴿مەم و زین داستانێکی فۆلکلۆری بوو ﴾ ﴿پاوەندێکی گوند سووتا﴾

4- ناوێکی کۆی ناسراو دیارخەری ناوێکی کۆی ناسراو بێت ،

وەکو ؛ ﴿ گوڵەکانی باخچەکان مەکەنەوە ﴾ ﴿وێنەکانی خوێندکارەکان ببینن﴾

5- ناوێکی دەست نیشان کراو دیارخەری ناوێکی دەست نیشان کراو بێت ،

وەکو ؛ ﴿ئەم نمرانەی ئەو خوێندکارانە دەدەمەوە﴾ ﴿ئەم پارانەی ئەو کرێکارانەم دایەوە﴾

6- ناوێکی تایبەتی دیارخەری ناوێکی گشتی نەناسراو بێت ، وەکو ؛ ﴿ گوێزی هەورامان دەکڕم ﴾ ﴿باخی بەختیاریم بینیوە﴾

تێبینی ؛ لە کرمانجی ژووروودا ئامرازی خستنەسەر بە پێی ژمارە و ڕەگەز خۆیان دەنوێنن ، وەکو ؛

1- نیشانەی ﴿ا﴾ بە دیارخراوی ﴿مێ﴾ ی تاك دەلکێن ، وەکو ؛ ئەو ژنەکا میهرەبان بوو .

2- نیشانەی ﴿ێ﴾ بە دیارخراوی ﴿نێر﴾ ی تاك دەلکێن ، وەکو ؛ کوڕێ پاشایێ بچویك هات .

3- نیشانەی ﴿ێد - ێت-ێن﴾ بە دیارخراوی کۆی ﴿نێر و مێ﴾ وە دەلکێن ، وەکو ؛

شارێد کوردستانێ خۆشن .          زارۆکێن گوندێن مە زرنگن.

## ئاوەڵکار

ئاوەڵکار ؛ وشەیەکە وەسفی کار دەکات و سنورێك بۆ ڕوودانی کار دادەنێت لە ڕستەدا.

ئاوەڵکار لەڕووی واتاوە دەکرێت بەم بەشانەی خوارەوە ؛

1- ئاوەڵکاری کاتی / ئەو ئاوەڵکارەیە کە کاتی ڕوودانی کارەکە دیاری دەکات ، وەکو

﴿ئێستا ، نیوەڕۆ ، وا ، شەممە ، ساڵێکی تر .... ﴾

2- ئاوەڵکاری شوێن / ئەو ئاوەڵکارەیە کە شوێنی ڕوودانی کارەکە دیاری دەکات ، وەکو

﴿لەسەر ، لەژێر ، لە تەنیشت ، لەناو ، لەدەر ، لە بنەوە ، لەسەربان .... ﴾

3- ئاوەڵکاری چۆنێتی / ئەو ئاوەڵکارەیە کە چۆنێتی ڕوودانی کارەکە دیاری دەکات ، وەکو

﴿ بە باشی ، بە نەرمی ، بەپەلە ، ئازایانە ، مەردانە .... ﴾

**4- ئاوەڵکاری چەندێتی / ئەو ئاوەڵکارەیە کە ڕادەی ڕوودانی کارەکە کە ڕوودەدات دیاری دەکات ، وەکو**

**( گەلێ ، نەختێ ، کەم ، زۆر ، فرە ، تۆزێ .... )**

**5- ئاوەڵکاری ڕێکخستن / ئەو ئاوەڵکارەیە کە ڕێکخستنی ڕوودانی کارەکە دیاری دەکات ، وەکو**

**( دەستە دەستە ، یەك یەك ، کۆمەڵ کۆمەڵ ، نم نم ، هێدی هێدی ... )**

**ئاوەڵکار لە ڕووی پێکهاتنیانەوە (ڕۆنانەوە) دەکرێت بە دوو جۆر :**

**1- ئاوەڵکاری سادە : ئەو ئاوەڵکارەیە کە لە وشەیەکی سادەی واتادار پێکهاتووە ، وەکو**

**( خێرا ، زۆر ، سەر ، کەم ، دوور ، خراپە ... )**

**2- ئاوەڵکاری ناسادە : کەئەمیش دوو جۆرە ( دارِژاو و لێکدراو )**

**أ- ئاوەڵکاری دارِژاو : ئەو ئاوەڵکارەیە کە لە وشەیەکی واتادار لەگەڵ پێشگرێك یان پاشگرێك یان لەگەڵ هەردووکیان پێك دێت ، وەکو :**

**1- پێشگری (بە) + ناو = (بەساڵ ، بەشەو ، بەدڵ ، بەگیان ، بەزستان .... )**

**2- پێشگری (بە) + هاوەڵناو = ( بەپەلە ، بەتەنیا ، بەڕێز ، بەگوڕ ..... )**

**3- پێشگری (بە) + هاوەڵکار = (بەزوو ، لەدوور ، لەتەنیشت ، لەنزیك ، لەناو ، لەژێر ... )**

**4- پێشگری (بێ) +ناو = (بێ نەوا ، بێ گومان ، بێ وچان ، بێ هێز ، بێ ناز ... )**

**5- ناو + پاشگری (انە) = ( پیاوانە ، کوڕانە ، کچانە ، منالانە ، ڕۆژانە ، سالانە ...)**

**6- هاوەڵناو + پاشگری (انە) = ( دلێرانە ، مەردانە ، ژیرانە ، هێمنانە ، ئازایانە ... )**

**7- پێشگر + ناو + پاشگر = ( بەبرایەتی ، بەزستانان ، بەسواری ، بێ باکانە ،بەپیاوەتی ... )**

**8- ناو + پاشگری (ێ) = ( ڕۆژێ ، شەوێ ، سالێ ، پایزێ ... )**

**9- پێشگر + هاوەڵناو + پاشگر = ( بەباشی ، بەچاکی ، بەجوانی ، بەگەرمی ... )**

**ب- ئاوەڵکاری لێکدراو : ئەو ئاوەڵکارەیە کە لە دوو وشەی واتادار یان زیاتر پێك دێت ، وەکو :**

**1- ناو +ئامرازی (بە) +ناو = ( ڕووبەڕوو ، ماڵ بەماڵ ، دێ بە دێ ، شار بە شار ، ساڵ بە ساڵ )**

**2- ناو +ئامرازی(او) + ناو = (سەراوسەر ، دەماودەم ، دۆلاودۆڵ ، پشتاوپشت .... )**

**3- دووبارەکردنەوەی ناو = ( نم نم ،دەستە دەستە ، پۆل پۆل .... )**

4- دوبارەکردنەوەی هاوەڵناو = ( جوان جوان ، هێدی هێدی ، وردە وردە ... )

5- دوبارەکردنەوەی هاوەڵناوی ژمارە =(یەك یەك ، دوو دوو ، سێ سێ .... )

6- ناو +(وە)+ ناو = (دەمەودەم ، شاخەوشاخ ، ماڵەوماڵ ... )

7- هاوەڵناو + و + هاوەڵناو = ( تێر و پڕ ، کز و مات ، پاك و خاوێن ، کز و مەلول .... )

8- هاوەڵناو + ئامرازی(بە) +ناو = ( پڕبەدڵ ، پڕبەدەم ، پڕبەدەنگ ، پڕبەزار .... )

9- پێشگر + هاوەڵناوی لێکدراو + پاشگر = ( بەسەربەرزی ، بەڕووخۆشی ، بەدلخۆشی ، بەدڵ شکاوی ... )

10- هاوەڵناوی نیشانە + ناو = ( ئەمشەو ، ئەمڕۆ ، ئەوساڵ ، ئەوسا .... )

11- هاوەڵکار +هاوەڵناوی ژمارە +ناو = ( پاش نیوەڕۆ ، دوای نیوەشەو ، پێش دوو ڕۆژ ...)

12- پێشگر + هاوەڵناوی ژمارە + ناو = ( بەیەکجار ، بەدوو جار ، بەسێ جار ... )

13- هاوەڵکار + هاوەڵکار(دووبارەکردنەوەی هاوەڵکار) = ( کەم کەم ، زوو زوو ، خێرا خێرا ، درەنگ درەنگ ... )

14- هاوەڵکار +ان + هاوەڵکار = (سەرانسەر ، بەرانبەر .... )

15- هاوەڵناوی ژمارە + ناو = ( نیوەشەو ، نیوەڕۆ ... )

## ڕادە

پ1/ چۆن دەتوانین ڕادەی هاوەڵناو دەربخەین ؟ وەڵام بدەوە بە نموونەوە

وەڵام / 1- هاوەڵناوی دیارخەر پێش هاوەڵناوی دیارخراو دەکەوێت .

2- ئامرازی خستنەسەری (ی) ناچێتە نێوانیانەوە .

3- هاوەڵناوی دیارخەر و دیارخراو پێکەوە گرێیەکی هاوەڵناوی پێك دەهێنن و دەبنە دیارخەری ناوەکە یان تەواوکەری کاری ناتەواو .

نموونە / 1- هۆنراوەیەکی زۆر جوانم نووسی . زۆر / هاوەڵناوی دیارخەرە ، ڕادەی هاوەڵناوە ، هاوەڵناوێکی چەندێتی یە . جوان / هاوەڵناوی چۆنێتی یە ، دیارخراوە . زۆر جوان /گرێیەکی هاوەڵناوی یەو دیارخەری ناوی (هۆنراوەیە) .

2- هۆنراوەکە زۆر جوان بوو .

زۆر / هاوەڵناوی دیارخەرە ، ڕادەی هاوەڵناوە ، هاوەڵناوی چەندێتی یە ۔

جوان / هاوەڵناوی چۆنێتی یە ، دیارخراوە ۔

زۆر جوان / گرێیەکی هاوەڵناوی یە و تەواوکەری کاری ناتەواوە ۔

3⇐ پیاوەکە زۆر بەپەلە بوو ۔ ڕادەی هاوەڵناوە و تەواوکەری کاری ناتەواوە ۔

پ2/ چۆن ڕأدەی هاوەڵکار دەردەخەیت ؟ وەلأم بەنمونەوە

وە/ 1⇐ هاوەڵکاری دیارخەر پێش هاوەڵکاری دیارخراو دەکەوێت ۔

2⇐ ئامرازی خستنەسەری (ی) ناچێتە نێوانیانەوە ۔

3⇐ هەردوو هاوەڵکاری دیارخەرو دیارخراو پێکەوە گرێیەکی هاوەڵکاری (چۆنێتی ، کاتی ، شوێنی) پێك دەهێنن و دەبنە تەواوکەری کاری ڕستەکە ۔ نمونە /

أ⇐ هۆنراوەکەم زۆرباش لەبەرکرد ۔

زۆر / هاوەڵکاری دیارخەرە ، ڕادەی هاوەڵکارە ، هاوەڵکارێکی چەندێتی یە۔

باش / هاوەڵکارێکی چۆنێتی یە ، دیارخراوە ۔

زۆرباش / گرێیەکی هاوەڵکاری چۆنێتی یە و تەواوکەری کاری (لەبەرکرد ) ە۔

ب⇐ هاورێکەم گەلێك زوو گەڕایەوە ۔

گەلێك / هاوەڵکاری دیارخەرە ، ڕأدەی هاوەڵکارە، هاوەڵکارێکی چەندێتی یە ۔

زوو /هاوەڵکاری کاتیە و دیارخراوە ۔

گەلێك زوو / گرێیەکی هاوەڵکاری کاتیە و تەواوکەری کارە ۔

ت⇐ هەژارەکە کەمێك نزیك دانیشتووە ۔ (میوانەکە کەمێك درەنگ گەیشت)

کەمێك / هاوەڵکاری دیارخەرە ، ڕادەی هاوەڵکارە ، هاوەڵکاری چەندێتی یە ۔

نزیك / هاوەڵکاری شوێنە ، دیارخراوە ۔

کەمێك نزیك ؛ گرێیەکی هاوەڵکاری شوێنی یە و تەواوکەری کارە ۔

تێبینی ؛ 1⇐ دەتوانرێت لە ڕستەیەکدا ڕادەی هاوەڵناو و ڕادەی هاوەڵکار هەبێت ، وەکو ؛

خانوویەکی زۆر خۆشم ، زۆر بەباشی دروستکرد ۰ هۆنراوەیەکی زۆر جوانم ، زۆربەباشی نووسیوە ۰

زۆرخۆش / رادە و هاوەڵناوە ۰ ، زۆربەباشی / رادە و هاوەلکارە ۰

2- ئەگەر وشەکانی (زۆر ، هەندێك ، گەلێك ، کەمێك ، تۆزێك ، برێك ، فرە ، پیچێك ) رادەی هاوەڵناویان دەرخست ئەوا پێیان دەوترێ هاوەڵناوی نادیار ، بەلام ئەگەر رادەی هاوەلکاریان دەرخست ئەوا پێیان دەوترێ ئاوەلکاری چەندێتی۰

3- گۆڕینی کار لە ناتەواوەوە بۆ تەواو یان بە پێچەوانەوە کاریگەری نیە لەسەر گۆڕینی هاوەلکاری کات و شوێن وەکو:

1- ئاهەنگەکە لەژێر دارەکە دەبێت ⟵ ئاهەنگەکە لەژێر دارەکە دەکرێت

گرێی هاوەلکاری شوێنە گرێی هاوەلکاری شوێنە

2- ئاهەنگەکە زۆر زوو دەبێت ⟵ ئاهەنگەکە زۆر زوو دەکرێت ۰ زۆر زوو : گریی هاوەلکاری کاتی یە

3- کاتەکەمان زۆر درەنگ بوو ۰ 4- باوکم زۆر درەنگ گەڕایەوە ۰ زۆر درەنگ : گریی هاوەلکاری کاتی یە

شانۆگەرییەکە پاش نیوەڕۆ بوو۰ شانۆگەرییەکە پاش نیوەڕۆ پێشکەش دەکرێت ۰ پاش نیوەڕۆ : گـهاوەلکاری کاتی یە

مندالە زۆر بچووکەکە زۆر نەخۆش بوو ۰ شانۆگەرییەکە زۆر جوان پێشکەش کرا۰

هەردووکیان گرێیەکی هاوەڵناوین گرێی هاوەلکاری چۆنێتی یە

تێبینی : ئەگەر کاری ڕستەیەك لەناتەواوەوە بگۆڕێت بۆ تەواو ئەوا گرێی هاوەڵناوی دەگۆڕێ بۆ گرێی هاوەلکاری ۰

1- مندالەکە زۆر جوانە ۰ 2- مندالەکە زۆر جوان دەڕوات ۰

گرێیەکی هاوەڵناوی یە و تەواوکەری کاری ناتەواوە گرێیەکی هاوەلکاری یە و تەواوکەری کاری تەواوە

# بەشی ئەدەب

ڕێڕەوی شیعری کوردی لە سالی (1939-1991) ز :

ڕێڕەوی شیعری کوردی لەم ماوەیەدا بەپێی ڕووداوە ڕامیاری و ڕووناکبیرییەکانی ناو کۆمەڵگای کوردی دابەش دەکرێت بۆ سێ قۆناغی جیاواز : 1- قۆناغی سالی 1939-1958 2- قۆناغی سالی 1958-1970 3- قۆناغی 1970-1991

قۆناغی یەکەم / ڕێڕەوی شیعری کوردی لە سالی (1939-1958)

ڕێڕەوی شیعری کوردی لەم قۆناغەدا بە درێژە پێدەری قۆناغی پێش خۆی دادەنرێ ، چونکە ناکرێت بە شێوەیەکی بنەڕەتی هێڵی ئاشکراو دیاری جیاکەرەوە لە نێوان ئەم قۆناغە و قۆناغی شیعری پێشوو دیاری بکەین.

پ/ تایبەتمەندی شیعری زیندوو چی یە ؟

و/ تایبەتمەندی شیعری زیندوو ئەوەیە کە گوزارشت لە کاتی لە دایکبوونی و هەلگری سیما و تایبەتمەندی قۆناغی نوسینی دەقەکە بکات .

پ/ ئەو هۆکارانە چی بوون کە گۆڕانکارییان لە شیعری کوردی ئەم قۆناغەدا کردووە ؟

و/ 1- ساتەوەختی پەژارە و ژەنگی سیاسی کاتی جەنگی دووەمی جیهانی .

2- خەباتی سیاسی و خۆپیشاندانەکانی کۆمەلانی خەلك لە عێراق بەگشتی و لە کوردستاندا بە تایبەتی .

## یەکەم / ناوەڕۆکی شیعری کوردی لە قۆناغی 1939-1958

1) لەڕووی نەتەوایەتی و نیشتیمانپەروەرییەوە :

بەهۆی سەرهەلدانی ئەو ڕووداوە ڕامیارییە گرنگانەی کەبەسەر کوردستان و ناوچەکەدا هاتن ، هەستی کوردایەتی لەلای گەلی کورد ئاڕاستەیەکی تری وەرگرت لە شیعری کوردیدا چونکە خەباتە خەباتە ڕامیارییەکەی ئەو سەردەمە چووە ناو دەقە شیعریەکانەوە

بەمەش ناوەڕۆکی شیعری کوردی زیاتر ؛

1- ڕووی شیعری نەتەوایەتی و نیشتیمانی و ڕامیاری کرد ۰

2- شیعر بووە هۆکارێك بۆ وشیارکردنەوەی میللەت لە پێناوی بەدەست هێنانی مافەکانیدا ۰

3- شیعری کوردی قۆناغەکە بەتەواوی گوزارشتی لە خواست و هیوای میللەتی کورد کردووە ۰

دیارترین ئەو شاعیرانەی کەلەبواری شیعری نیشتیمان پەروەریدا بالآدەست بوون ئەمانەن ؛

﴿ زێوەر ، پیرەمێرد ، بێکەس ، شێخ نوری ، دلدار ، هەژار ، هێمن ، گۆران ، هەردی ، جگەرخوێن ، ع۰ح۰ب ، کامەران موکری ﴾

پ/ ئەو شاعیرانە کامانەن کە لەناو کۆڕی خەباتی ڕامیارییەوە هاتنە ناو جیهانی شیعری کوردییەوە ؟

و/ ﴿ هەردی ، هێمن ، هەژار ، کامەران موکری ، جگەرخوێن دیلان ، ع۰ح۰ب ﴾

پ/ ﴿هێمن﴾ی شاعیر لە چ قۆناغێکی شیعریدا شیعری نوسیوە ؟ شیعرەکانی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە چۆن بوون و دەرخەری چی ڕاستیەکن ؟ بەنمونەی شیعریەوە ڕونی بکەرەوە

و/ لە قۆناغی یەکەم ﴿1939-1958﴾ شیعری نوسیوە ، شیعرەکانی نیشتیمانی و نەتەوەیی بوون و بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ دەرخەری ئەو ڕاستییەیە کەهەست و نەستی کوردایەتی بەتەواوەتی شیعری کوردی قۆناغەکەی داگیرکردووە ۰

گەرچی توشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دردەم ئەمن

قەت لە دەست ئەم چەرخە سپڵە✼نابەزم مەردم ئەمن

ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خاڵ نم

ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن

✼ تێبینی ؛ وتنی ئەم وشانە لەدلەوە کوفرە ﴿"چەرخ سپڵە نیە بەڵکو مرۆڤەکانن کە ئەم دنیایە بەرەو خراپی و ناشرینی ئەبەن" چونکە ڕۆژگار هی خوایە و خوا دروستی کردووە هەرکەسێك جنێوی پێبدا وەك ئەوە وایە جنێو بە خوا بدات ﴾ لەبەرئەوە وریابن لەکاتی وتنی دا و بەخەلکیشی بگەیەنن لەگەڵ ئەوپەڕی ڕێزمان بۆ شاعیرانی کورد ۰

پ/ (جگەرخوێن) ی شاعیر لە چ قۆناغێکدا شیعری نووسیوە ؟ هەستی کوردانەی خۆی بۆچی دەردەبڕێت ؟ لەچی شیعرێکدا ؟

و/ لە قۆناغی یەکەم (1939-1958) شیعری نووسیوە ، هەستی کوردانەی خۆی بۆ سەربەخۆیی و هەڵکردنی ئاڵای کوردستان دەردەبڕێت و لە شیعری (ئالا من ) دا .

(ئالا من )

ئالا من ڕەنگین پیرۆزی خووەش ته هەلدگرم دچم بمەش

تۆ ل سەر ملێن خورتێن جان دناڤ تەدە یەك ڕۆژەك گەش

ئالا سێ ڕەنگی تو بناڤ و دەنگی تو

نیشانا جەنگی تو ئەی خورتێن کوردان سلاڤی لێبکەن

---

پ/ بۆچی شاعیرانی کورد شیعریان بۆ خەبات و تێکۆشانی گەلانی تر نووسیوە لە پێناوی سەربەخۆییدا ؟ شیعری کوردی لە قۆناغی (1939-1958) چ پەیامێکی هەڵگرتبوو ؟ بۆچی ؟

و/ شاعیرانی کوردی شیعریان بۆ خەبات و تێکۆشانی گەلانی تر نووسیوە لە پێناوی سەربەخۆییدا و هەوڵیان داوە لە ڕێی ئەو شیعرانەوە پەیامی خەباتی هاوبەشی گەلانی چەوساوە و ژێردەستە لە پێناوی سەربەرزی و ڕزگاربوون لە کۆتی ژێردەستەیی پیشان بدەن ، هەرلەم قۆناغەدا شیعری کوردی پەیامی مرۆڤایەتی هەڵگرتبوو ، چونکە هەرگیز بەتەنیا لەبیری نەتەوەکەی خۆیدا نەبووە تا بە ئاڕاستەیەکی ڕەگەز پەرستانەیدا ببات ، بەڵکو شیعری کوردی کانیاوی بیری ئازادیخوازی گەلانی تری جیهان بووە .

2) لەڕووی سروشتەوە :

پ/ بۆچی سروشت لە قۆناغی (1939-1958) لەو وەسفە ڕووتەی کەلەشیعری کلاسیکیدا هەی بووە دەربازبووە ؟ دیمەنی سروشتی کوردستان کاریگەری لەسەر چ شاعیرێك هەبووە ؟ بە نمونەی شیعرییەوە وەلآم بدەرەوە .

وە/ سروشت لە شیعری ئەم قۆناغەدا لەو وەسفە ڕووتەی کەلە شیعری کلاسیکدا بوونی هەبووە دەربازبووە ، بۆئەوەی هەستی ڕۆلەکانی کورد بجولێنێت لە پێناو دروست کردنی هەستی خۆشەویستی کوردستان لەناخیاندا تا ولآتەکەیان زیاترخۆشبوێت

(دیلان) دیمەنی سروشتی کوردستان کاری تێدەکات و دەلێت :

بەهار

وا بەهار دیسان تارای ئەپۆشێ

گولاڵە پیاڵەی خوێنین ئەنۆشێ

نێرگس ئەندام شۆڕ ڕەنگی زێڕینی

وەنەوشە و کوڕنووش پەڕەی چین چینی

3) لەڕووی جوانی ئافرەت و کێشەکانییەوە :

پ/ بۆچی لە شیعری (1939-1958) بەشێوەیەکی جیاوازتر باس لە ژن کراوە ؟ وەلام بە نمونەی شیعرییەوە

و/ باسکردنی ژن تەنها لە چوارچێوەی جوانی ڕوخساریدا نەماوەتەوە ، بەڵکو لا لەکێشەکانی کراوەتەوە ، شاعیران وا باسی ژنیان کردووە کە ژن وەکو پیاو مرۆڤە ، وەکو پیاویش ئەرك و مافی خۆی هەیە و دەبێت بەشداربێت لە کۆڕی سیاسی و تێکۆشاندا ، دەبێت ژنی کورد لە کۆتی دیلی و دواکەوتوویی و هەموو ئەو داب و نەریتانە ڕزگاری بێت کە دەرفەتی بەشداربوونی ژنان لە بوارەکانی ژیاندا لاوازدەکەن و ڕۆلیان ناهێلن ، (بێکەس) باش ئەم دیمەنە دواکەوتوویە لەناو کۆمەلگادا بەرجەستە دەکات و دەلێت :

مەلێ من کچم تۆش وەکو منی

موحتاجی عیلم و فەن و خوێندنی

مەجبوری ئیش و خزمەت کردنی

هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە

سەرپۆش فرێدە چ وادەی شەرمە

پ/ ئاوێتەکردنی ژن لەگەڵ کێشە ڕامیارییەکان بووە هۆی چی ؟

و/ بووە هۆی ئەوەی کە ڕەنگدانەوەی ژن لە شیعری کوردی قۆناغەکەدا وەکو خۆشەویست بەرتەسك بێتەوە .

دیارترین شاعیری ئەم قۆناغە لە بواری خۆشەویستی شیعری بۆ (ژن) نوسیوە ئەحمەد هەردی یە کە دەڵێت :

گەرچی دلداری لە خاکی ئێمەدا ئەفسانەیە

هەر بەتەنیا بۆ کوڕی خاوەن تەلار و عانەیە

گیانەکەم ئەمما دلی من لەو دلە شێتانەیە

بێئەوەی هیچ شك بەرێ کوژراوی ئەو چاوانەیە

4) لەڕووی کێشەی کۆمەلایەتی یەوە :

پ/ دیارترین کێشەی کۆمەلایەتی لە پاڵ کێشە ڕامیارییەکاندا بریتی بووە لە چی ؟ دەقە شیعرییەکانی ئەم قۆناغە پالپشتی کێ بوون ؟ بە نموونەی شیعرییەوە ڕوونی بکەرەوە

و/ دیارترین کێشەی کۆمەلایەتی لەم قۆناغەدا کێشەی چینایەتی بوو ،، شاعیرانی کورد زیرەکانە و وشیارانە ئەم کێشەیەیان ئاوێتەی کێشەی ڕامیاری میللەتەکەیان کردووە ، سەرجەم دەقە شیعرییەکانی ئەم قۆناغە پالپشتی چینی چەوساوەبوون و دژی زۆرداران وەستاونەتەوە و بەردەوام هاوڕێی جوتیار و کرێکار و زەحمەتکێش بوون .

لەم بارەیەوە (قانیع) لە شیعری (قەلاچۆی دوژمن) دا دەڵێت :

باهەموو جوتیار و پالە و ڕەنجبەران    یەکگرن تادەبنە هێزو پشتیوان

هەلگرن یەکسەر دروشمی هاوبەشی    بێ جیاوازی لەسەر ڕەمز و نیشان

پ/ لەڕووی ناوەڕۆکەوە شاعیرانی قۆناغی (1939-1958) ڕوویان لە نوسینی چ جۆرە شیعرێك کردووە ؟لەهەمان کاتیشدا بایەخیان بەچی داوە ؟

و/ شاعیرانی کورد ڕوویان لە کێشەی ڕامیاری و نەتەوایەتی و چینایەتی کردووە ، لەهەمان کاتیشدا بایەخیان بە ئاشتی و هاوخەباتی و مرۆڤ دۆستی داوە .

## دووەم / ڕووخسار و تەكنیكی شیعر لە قۆناغی 1939-1958 :

پ/ ئەو شاعیرانە كێن كە لە قۆناغی (1939-1958) دا بنیاتی ڕوخساری شیعری كوردییان گۆڕیوە ؟ شیعری كوردییان بەرەو چ قالبێك بردووە ؟ وەكو كێ؟

و/ چەند هەوڵێكی تاكە كەسی دەبینین وەكو (قەدری جان ، گۆران ، كامەران موكری ، دیلان ) ، دیلان لە ساڵی (1954) لە پارچە شیعری (ڕێگای خەبات) دا كە ناوی ناوە پارچەیەكی (مەنسور) بنیاتی دەقی شیعری كوردی دەگۆڕێت و بەرەو قالبێكی ئازادی دەبات ،هەر لەم بوارەشدا (كامەران موكری) لە ساڵی (1957) بە پارچە شیعری (كچەشوان) ڕوو لە شیعری سەربەست دەكات و بە شێوازێكی نوێ مامەڵە لەگەڵ (كێش و سەروا) دا دەكات دەڵێت :

ئەی كچە شوان

هەلالەیی

ئەی كەنیزەی كەژی كوێستان

بە شێنەیی

نەرم و نیان

بە ئاوازی شمشاڵەكەت

بەلەرەی لێوە ئاڵەكەت

هەستی خۆشیم بێنەفڕین

بۆ ناو گوڵزار

چەم و نزار

بەڵام دیارە ئەو هەوڵە تاكە كەسیانە نە لای ئەو شاعیرانە خۆیان ، نەلای شاعیرانی تری ئەم قۆناغە بەردەوام نەبوو ، تابتوانن بەتەواوی ڕێچكەی شیعری سەربەست لەئەدەبی كوردیدا بكەنەوە .

پ/ لە قۆناغی (1939-1958) چۆن زمانی شیعری پەرەی پێدرا ؟ کێ ئەم هەوڵەی لەلا بەدی دەکرێت ؟ لەگەڵ نوسینی هۆنراوەکەی ؟

و/ زمانی شیعری گرنگی پێدراو بەرەو کوردی پەتی هەنگاوی بەرەو پێشتری نابوو ، هەروەها فەرهەنگی شیعری ئەم قۆناغە زیاتر دەوڵەمەندکراوە ، بوارە جیاجیاکانی خەباتی ڕامیاری و شیعری جوانی سروشت و کێشەکانی ژن دەیان وشەی تریان هێنایە ناو شیعری کوردی یەوە ، وەبەسوود وەرگرتن لەئەدەبی فۆلکلۆری کوردی گەلێك لە شاعیران زمانی شیعری ئەو قۆناغەیان پێ دەوڵەمەندتر کرد ، (قەدری جان) یەکێك بوو لەو شاعیرانەی کەئەم هەوڵەی لەلا بەدی دەکرێت :

(کاروانێ مە)

| | |
|---|---|
| ئەم هیچ نەوەستیاین ، ناوەستین | ل سەر بەرفان |
| لەسەر ڤێ ڕێیا دوور | با و باگەر ل شکەفتان |
| سەر ڤێ ڕێیا دژوار | دبن دلۆپان |
| ئەم دچن و ئەمێ بچن | ب لنگی خاس |
| بەر ب ئارمانجا خۆ | کاروانێ مەدچە |
| ل بن باران | بەرب ئارمانجا خۆە |

پ/ بۆچی لە قۆناغی (1939-1958) سروود بەرەو پێشەوە چوو ؟ کام جۆرەی سروود پێشکەوت ؟ لە شیعری کێدا دیارە ؟ بە نمونەی شیعرییەوە وەڵام بدەرەوە

و/بەهۆی فراوان بوونی خەباتی نەتەوایەتی گەلی کورد ، سرودیش بەرەو پێشەوەچونێکی بەرچاوی بەخۆیەوە بینی ، بەتایبەتی ئەو سروودانەی کە بۆ جەژنی نەتەوەی کورد (نەورۆز) دەوتران ، ئەمەش لە شیعرە بەناوبانگەکەی (پیرەمێرد)دادەردەکەوێت و دەڵیت :

ئەم ڕۆژی سالی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بە هاتەوە
چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمەی پێ پەست بوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکان بوو بەگوڵی ئالی نەو بەهار

پ/ بە شێوەیەکی گشتی شیعری کوردی لەڕووی تەکنیك و ناوەڕۆکەوە هەڵقوڵاوی ناوجەرگەی کۆمەڵی کوردەواری بووە ، واتە گوزارشتێکی ڕاستەقینەی لە ژیانی خەڵك کردووە ،شاعیرەکانمان ویستوویانە کۆمەڵانی خەڵك وشیاربکەنەوە تا لە داوا و مافە ڕەواکانی خۆیان بێدەنگ نەبن ، بۆیە بەزمانی ئەوان شیعریان وتووە ، ئەتوانین بڵێین شاعیرانی کورد زمانحاڵێکی بەوەفای میللەتەکەی خۆیان بوون و لەسەنگەری میللەت خۆیان جیانەکردووەتەوە و ڕووداوە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکانی ئەم قۆناغەی گەلی کوردیان بەرجەستە کردووە

## قۆناغی دووەم / ڕێڕەوی شیعری کوردی لە قۆناغی (1958-1970)

یەکەم / ناوەڕۆکی شیعری کوردی لە قۆناغی (1958-1970)

پ/ ڕێڕەوی شیعری کوردی لە قۆناغی (1958-1970) پەیوەستە بە چییەوەو بە پێی چی دیاریکراوە ؟ باس بکە

و/ پەیوەستە بە دوو ڕووداوی سیاسی گرنگ لە عێراقدا ؛

1- ساڵی (1958) ساڵی ڕوودانی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژە کە ئەم ڕووداوە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ کاردانەوەی بەسەرباری ڕووناکبیری و ئەدەبی گەلانی عێراق بەگشتی و گەلی کورد بە تایبەتی هەبوو

2- ساڵی (1961) ساڵی سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلولە ، کەئەم ڕووداوە ڕامیاری یە ڕاستەوخۆ بەشێوەیەکی دیار کارتێکردنی هەبوو لەسەر باری ڕووناکبیری و ئەدەبی کوردی لە کوردستانی عێراق .

پ/ بۆچی شیعری کوردی لە قۆناغی (1958-1970) ڕاستەوخۆ دەنگی خۆی خستەپاڵ ئامانجەکانی شۆڕشی چواردەی گەلاوێژەوە؟ باسی بکە

و/ شیعری ڕاستەوخۆ دەنگی خۆی خستەپاڵ ئامانجەکانی ئەم شۆڕشەوە بە هیوای ئەوەی کە لە سایەی شۆڕشدا ک==========ورد بەمافە ڕامیارییەکانی شادبێت ، هەر ئەم تیرِوانینەش بۆ شۆڕش لەم قۆناغەدا وای کرد کە شاعیرانی کورد دەیان پارچە شیعر بەسەر شۆڕش و سەرکردایەتی شۆڕشدا بڵێن و بەرگرییان لەو دەسکەوتانە دەکرد کە شۆڕش بەدەستی هێنابوو .

پ/ بۆچی ئەو هیوایەی کە کورد بە شۆڕشی 14ی گەلاوێژ هەیبوو هەر زوو پوکایەوە ؟

و/ چونکە بەرەبەرە پشت لە ماف و خواستەکانی گەلی کورد کرا ، شاعیرانی کورد هەر لە سەرەتاوە دەرکیان بەو پاشگەزبوونەوەیەی سەرکردایەتی شۆڕشی 14ی گەلاوێژ کردبوو بەرامبەر بەگەلی کورد ، بۆیە دەبینین کۆمەڵێ دەقی شیعری کوردی لەسەرەتای

شەستەكانی سەدەی ڕابردوودا ڕەنگدانەوەی ئەو نائومێدبوونەی كورد بەرامبەری شۆڕشەكە دەردەخەن ۔

پ/ لەگەڵ سەرهەڵدانی شۆڕشی ئەیلولی ساڵی (1961) ز دا شیعری كوردی چۆن بوو ؟ كام لە شاعیران بەشداری ڕاستەوخۆی هەبووە شان بەشانی پێشمەرگە ؟ باسی بكە بە نمونەی شیعریەوە

و/ شیعری كوردی ڕاستەوخۆ چووە ناو سەنگەری پێشمەرگەوە و پتەوتر و سورتر ، جەختیان لەسەر مافە ڕامیاری و نەتەوەییەكانی گەلی كورد دەكردەوە ، هەربۆیەش سیمای هەرە دیاری ناوەڕۆكی شیعری كوردی لەم قۆناغەدا مەبەستی ڕامیاری و نەتەوایەتی بووە ۔ نمونەی ئەم بەشدارییە ڕاستەوخۆیەی شیعری كوردی لە شۆڕشدا شان بە شانی پێشمەرگە لەم شیعرەی هەژاری موكریانی دا دەردەكەوێت كە دەڵێت ؛

نیشتمانی كورد ، گەلێك پیرۆزی سوێندت⁂ پێ ئەخۆم

بۆ سەربەخۆیت بە گیان و بەدڵ ، بە قوربانی تۆم

زۆر لاوی ئازات ، لە كۆڕی خەبات ، خوێنی خۆیان ڕشت

زۆر شێخ و پیران ، لەزانا و ژیران ، خۆیان دا بەكوشت

⁂ئەبێت وریابین سوێندخواردن تەنها بە خوا دروستە و جگە لەو دروست نیە

ئەم بایەخ دانەش بە كێشەی نەتەوایەتی ، نەك هەر نەبووە هۆی ئەوەی كە ئاسۆی بەردەمی شاعیران تەسك بكاتەوە ، بەڵكو فراوانتری كرد و شاعیرانی كورد لە پاڵ ئاوڕدانەوە لە خەباتی نەتەوەكەیان باوەشیان بۆ خەباتی گەلانی تری ماف خوراو كردەوە، هەروەك چۆن (كامەران موكری) ڕوو لە شۆڕشی جەزائیر دەكات و (دیلان) پشتگیری لە (لۆمۆمبا) ی كۆنگۆ دەكات ۔

---

دووەم / ڕوخسار و تەكنیكی شیعر لە قۆناغی (**1958-1970**) ؛

پ/ زمانی شیعری كوردی لە قۆناغی (**1958-1970**) چۆن بوو؟ ئایا گۆڕانی بەسەردا هاتووە ؟

و/ لەبەرئەوەی بابەتی سەرەكی لە ناوەڕۆكی دەقە شیعرییەكاندا مەبەستی ڕامیاری بووە ، ئەوا زمانی شیعریش لە چوارچێوەی هەمان مەبەست دەسوڕایەوە ، بەم شێوازانە ؛

**1**- لە شیعری ماوەی نێوان(**1958-1961**) زمانی شیعری هەڵگری سیمای خۆشی و شادی بووە بەرامبەر بە شۆڕشی چواردەی گەلاوێژ بە ئومێدی بەدیهێنانی مافەكانی گەلی كورد ، هەر بۆیە ئەو وشە شیعرییانەی لەم ماوەیەدا دەقی شیعرییان پێ

دەنوسرا شادی و گەشبینی و ئومێدی تێدا دەبینرا .

2- لە شیعری ماوەی نێوان (1961-1970) کە شۆڕی ئەیلول سەری هەڵدا زمانی شیعر بەرگی خەم و پەژارە و نائومێدی پۆشی بەتایبەتی لەدەستە سالانی سەرەتای هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلولدا .

3- زمانی شیعری بەرەو هەڵگرتنی شەقلی بەرەنگاربونەوە و چۆکدانەدان دەڕۆیشت بەو پێیە شیعر لەم سەردەمەدا ئەوەندەی مەبەستی گەیاندنی پەیامەکە بووە، ئەوەندە مەبەستی دەرخستنی توانستی زمانی شیعری نەبووە؟

پ/ کێش و سەروا (قافیە) لەشیعری کوردی قۆناغی (1958-1970) چۆن بووە؟ ئایا بوو بە ڕەوتێکی دیاری کراو ؟بەبەلگەوەباسیبکە

و/ لەڕووی کێش و سەرواوە زیاتر کێشی برگەیی و سەروای مەسنەوی (جووت سەروا) ی پەیرەوکردووە ، بۆ نمونەلای (دیلان ، قەدری جان) شێوازی بەکارهێنانی سەروا تارادەیەك گۆڕانی بەسەردا هاتووە ، دەقە شیعرییەکان بەرەو بنیاتی شیعری سەربەست براون ،بەلاّم دیارە ئەو هەولانەی لەو سەردەمەدا کە لەپێناوی گۆڕینی دەقی شیعریدا نراون هەولی تاکەکەسی بوون و نەبوون بە دیاردە ، تەنانەت ئەو هەولە نوێگەرییەی کەلە تاقیکردنەوە شیعرییەکانی (سوارەی ئیلخانی زادە) دا دەبینرێت لە کوردستانی ڕۆژهەلاتدا هەر لە بازنەی هەولی تاکەکەسیدا مایەوە و نەبوو بەرەوتێکی دیاری شیعری کوردی لەم قۆناغەدا .

پ/ هۆنراوەی (بێشکەی منالّ) خاوەنەکەی کێ یە؟ کەی نوسیویەتی ؟ چ شتێکی تازەی تیا دەبینرێت ؟ شاعیر لەم شیعرەدا دژی کێ وەستاوە؟ بە نمونەی شیعرییەوە باسی بکە .

و/ (بێشکەی منالّ) هۆنراوەی گۆرانە ، لە (12-6-1962) ماوەیەك پێش مردنی نوسیویەتی ، لەم شیعرەدا سەروای تازە دەبینرێت ، لێرەدا گۆران دژی شەڕخوازان وەستاوەتەوە و لەگەلّ ئاشتیدایە .

بێشکەی منالّ

ئای ئەو مالە چەند بێ باکە

کەلەباروت و لە بۆمبا

ژێر بێشکەی منالیان پاکە

ئای چەن خۆشە مالێکی بێ وا

ڕووی دنیا ،ئەم پەڕ تا ئەوپەڕی

دلنیابین بێشکەی ساوا

نابێتە خۆلەمێشی شەڕ

## قۆناغی سێیەم / ڕێڕەوی شیعری كوردی لە قۆناغی (1970-1991)

ڕێڕەوی شیعری كوردی ئەم قۆناغە دابەش دەبێت بەسەر دوو ماوەی جیاوازدا بەم شێوەیە :

أ- ڕێڕەوی شیعری كوردی لەماوەی نێوان سالآنی (1970-1975)

ب- ڕێڕەوی شیعری كوردی لە ماوەی نێوان سالآنی(1975-1991)

### 1- ڕێڕەوی شیعری كوردی لەماوەی نێوان سالآنی (1970-1975)

پ/ دیارترین سیمای شیعری كوردی لە قۆناغی (1970-1975) چی بوو ؟ ڕۆڵیان چی بوو ؟

و/ دیارترین سیمای شیعری كوردی لەم قۆناغەدا بریتی بوو لەسەرهەڵدانی گرووپی (ڕوانگە) لەسالی (1970) ، ئەم گروپە توانی ڕۆڵێكی گرنگ و كاریگەر ببینێت ، لەو گۆڕانەی كەبەسەر ناوەڕۆك و فۆڕمی شیعری قۆناغەكەدا هات .

پ/ تێڕوانینی شاعیرانی گروپی ڕوانگە بۆ شیعر چی بوو لە قۆناغی (1970-1975) ؟

و/ شاعیرانی ڕوانگە هەڵگری تێڕوانینێكی جیاوازبوون بۆ شیعر ئەوان لەپاڵ ئەو گۆڕانەی بەسەر فۆڕمی شیعردا هێنایان ، دەیانویست شیعری پەیامی یاخیبون بگەیەنێت ، ئەم هەستەش بەجۆرێك بوو تێكڕای شیعری كوردی لەم قۆناغەدا گرتبۆوە.

#### تایبەتمەندی شیعری كوردی لەم قۆناغەدا

ناوەڕۆكی شیعری كوردی لە نێوان سالآنی (1970-1975) دا

پ/ ناوەڕۆكی شیعری كوردی لەڕووی بیری نەتەوایەتییەوە لە نێوان سالآنی (1970-1975) چۆن بوو ؟

و/ شیعری كوردی لەم قۆناغەدا هەڵگری گوتارێكی نەتەوەیی قوڵ بوو ، كە بریتی بوو لەو پەیامەی كەبەرگری دەكرد لە پێناوی پاراستن و مانەوەی نەتەوەی كورددا ، شیعر دژی جەور و ستەم و زۆرداری دوژمن دەوەستایەوە و لەم بوارەدا وەكو هێزێكی كاریگەر ڕۆڵی بینیوە ، ئەم هەستەش بە ئەندازەیەك كاریگەر بووە كە ڕەنگە كەم شاعیری كورد لەم قۆناغەدا ببینین كەشیعری بۆ كورد و سەربەخۆیی كوردستان نەنوسیبێت ،لەپاڵ شیعری (نیشتمانی و خۆشەویستی) دا كە قۆناغەكانی پێشووی پێ دەناسرێتەوە ، گەلێ بابەتی نوێ هاتە ناو شیعری كوردییەوە ، وەك (مرۆڤ و مرۆڤایەتی ، ژیان و مردن ، شارستانیەت ، ژن وەك خاوەن كێشەیەك ....هتد

پ/ چۆن شیعری ئەم قۆناغە هەڵگری بیری فەلسەفی و مەعریفییە ، لەو بیرە فەلسەفیانەوە سەرچاوەی دەگرت كە سەرچاوەكەی لەسەرچاوەی بیرە فەلسەفییەكانی ڕۆژئاوا و هاوچەرخ بووە ، شیعری كوردی لە قۆناغەكانی پێشوودا سەرچاوەی بیرە فەلسەفیەكانی لە كلتورە ڕۆژهەلاتیەكانەوە وەرگیرابوون .

**پ/ دیارترین خاسیەتی شیعری کوردی لە قۆناغی (1970-1975) چی بوو ؟ ئەم خاسیەتە لە بنەڕەتدا چەندجۆرە ؟ باسیان بکە**

**و/ (یاخیبوون) دیارترین خاسیەتی شیعری کوردی ئەم قۆناغەیە ، لەبنەڕەتدا دوو جۆر یاخیبوون هەیە :**

**1- یاخیبوونی کۆمەلآیەتی : ئەمەش یاخیبوون لەدابو نەریتە کۆمەلآیەتییە باوەکان دەگرێتەوە .**

**2- یاخیبوونی ڕامیاری : ئەم جۆرە یاخیبوونەش لە پێناوی ئازادی و سەربەستی مرۆڤدایە .**

**(لەتیف هەلمەت) یەکێکە لە شاعیرە دیارەکانی قۆناغەکە کە (بە سوود بینین لە ئەفسانە و هێما مێژووییەکانی ناو کلتوری نەتەوەی جیهانی) وێنەی ئەم یاخیبوونە پیشان دەدات و دەلێت :**

**پێتان ئەلێم ... پێتان ئەلێم ...یاخی ببن ...یاخی ببن**

**لەم هەموو نەخشەو باجە**

**یاخی ببن لەم مەیدانە لەم گەراجە**

**کە مرۆڤ وەك ئامراز تیایدا هەڕاجە**

**یاخی ببن ........یاخی ببن**

**لەو قەمانەی**

**کە سوری خوێنی حەلاجە**

**پ/ لە ناوەڕۆکی شیعری کوردی سالآنی (1970-1975) دا چۆن باسی فەلسەفەی ژیان و مردن کراوە ؟ تێڕوانینی شاعیرانی کورد چۆن بووە؟**

**و/ شاعیرانی کورد وەك بابەتێکی گرنگ لەم مەسەلەیە دواون ، تێڕوانینی هزری و فەلسەفی خۆیان لەم بارەیەوە خستۆتە ڕوو ، هەندێکیان ڕەشبینانە لە ژیانیان ڕوانیوە و بەشتێکی دەمامك کراوی کاتییان زانیوە ، بەلآم هەندێکی تریان گەشبینانە لە ژیانیان ڕوانیوە و ڕووە گەشەکانیان بەرجەستە کردووە، هەربۆیەش پرسیارە فەلسەفییەکانی شاعیران لەچوارچێوەی _(ژیان ومردن) دا بوون ، دواجار هەرخۆیان زۆرجار ڕەشبینانە وەلآمیان داونەتەوە ، یاخود وەلآمی پرسیارەکانیان بۆ خوێنەر بەجێهێشتووە ، (شێرکۆ بێکەس) لە شیعری (گینگلٚ) دا بەڕوونی تێڕوانینی خۆی دەربارەی ژیان و مردن دەخاتەڕوو و دەلێت :**

**ویستم ئەوە لەزەریایەك بگەیەنم**

**گەر جۆگەکان نەبن ....ناژی**

**خندکاندمی**

**ویستم ئەوە لە بروسکە بگەیەنم**

گەر هەورەکان نەبن ۰۰۰۰ناژی

سوتاندمی

تۆ کێی _ تۆ کێی ؟

هەتاوێکم بە بێ ئاسۆ ۰۰۰

پ/ بۆچی شاعیرانی ئەم قۆناغە کەمتر کەوتوونەتە ژێر کاریگەری و کارتێکردنی شاعیرانی پێش خۆیان؟

و/ شاعیرانی ئەم قۆناغە کەمتر کەوتوونەتە ژێر کاریگەری و کارتێکردنی شاعیرانی پێش خۆیان واتە لە هەوڵی ئەوەدا بوون کەلەشیعری ئەوان لابدەن، تەنها لەو کاتانەدا سوودیان لێ بینیون کە شیعرەکانیان درێژە پێدەری ڕەوتی یاخیبونی ئەوان بووە ۰

## ڕوخسار و تەکنیکی شیعری کوردی لە نێوان سالانی (1970-1975)دا :

پ/ وێنەی شیعری لەنێوان سالانی (1970-1975) چۆن بوو؟ سەرچاوەی ئەم وێنە شیعرییانە لەچیەوە وەرگیراون ؟

وەلام /

1- وێنەی شیعری لەم قۆناغەدا بەتەواوەتی خۆی دەربازکردووە لە لاسایی کردنەوە و جوینەوەی وێنەی دووبارە ۰

2- لەشیعری ئەم قۆناغەدا گەلێك وێنەی جوان بەکارهاتووە کەسەرچاوەکەی لە ڕووداو و کارەشانە مێژوویيەکە و نەتەوەیی و جیهانییەکانەوە وەرگیرابوون ۰

3- لەشیعری ئەم ماوەیەدا وێنەی ڕووتی ڕەوانبێژی تیادا بەکارنەهاتووە ۰

4- وێنەی شیعری لەم ماوەیەدا لە پێناوی گەیاندنی پەیامێکدا بووە و مەبەستێکی تایبەتی لەگەڵدابووە ۰

پ/ زمانی شیعری کوردی لەسالانی (1970-1975) چۆن بوو؟ ئایا جیاوازە لە زمانی خەلکی ؟ وەلام /

1- شاعیران هەولیان داوە کە وشەکان لە ناودەقە شیعرییەکان لە ئاماژە کۆنەکان دابڕن و ئاماژەی نوێیان بدەنێ ، واتە (واتای فەرهەنگی) لە وشەکاندا دەمالێت و واتای نوێیان پێ دەبەخشێت ۰

2- زمانی خوازەیی پانتایی شیعری کوردی داگیرکردبوو ، کەئەمەش وادەکات وشەکان ڕاستەوخۆ واتانەدەن بەدەستەوە و زمانی شیعر ئالوزە و خوێنەری شیعر بەئاسانی لەواتای وشەکان ناگات ۰

3- زمانی شیعر لەم ماوەیەدا لەچوارچێوەی کوردی پەتیدا دەسوڕایەوە بەلام بەئاستێکی دەولەمەندتر و ئالۆزتر لە زمانی کوردی پەتی قۆناغەکانی پێشوو ۰

4- گەلێك وشە و زاراوەی نوێ هاتە ناو زمانی شیعرەوە وەك وشە و زاراوەکانی ( گیڤارا و ئەهریمەن و ئاهورامزاد و زەردەشت و ئاڤێستا ۰۰۰)

5– گەلێك دەقی شیعری لەم قۆناغەدا دەبینین کە لەپێناو گەیاندنی ڕاستەوخۆی مەبەستی شیعرەکاندا بەشێوەیەکی سادە خراوەتە بەردەست ۰

6– بەکارهێنانی هێماو نیشانە لە دەقە شیعرییەکاندا بە هێماو نیشانەی خۆمالی و جیهانیەکانەوە ۰

پ/ کێش و سەروا لە شیعری کوردی سالانی (**1970–1975**) چۆن بوو؟

و/ **1**– کێش : شاعیرانی کورد زیاتر پەیڕەوییان لەشیعری سەربەست کردووە لەگەڵ ڕیچکەکەشدا دیاردەی مامەڵەکردنێکی جۆراوجۆر لەگەڵ چەمکی هۆنراوەی سەربەستدا سەری هەڵدا و بووە هۆی ئەوەی کە زۆرجار هەر سێ چەمکی هۆنراوەی سەربەست و بێ سەروا و پەخشانەشیعر تێکەڵ بکرێت، دیارترین شەقلی شعری سەربەست دوای بلاوبوونەوەی بانگەوازی ڕوانگە لەوەدا بوو کە ڕوویان کردە بەکارهێنانی کێشی هەشت بڕگەیی و چوار بڕگەیی ۰

**2**– سەروا : سەرواش بەهەمان شێوەی بەکارهێنانی مامەڵەی لەگەڵدا کراوە چونکە نەسەروای یەکگرتوو نەسەروای مەسنەوی یان بەکارنەهێناوە ، بەڵکو بەشێوەیەکی ئازادانە مامەڵەی لەگەڵدا کردووە ۰

پ/ تەکنیکی شیعری کوردی سالانی (**1970–1975**) چۆن بوو ؟ سوودی لە چی بینیوە ؟

و/ تەکنیکی شیعری کوردی ئەم ماوەیە سوودی لە داستانە میللی و فۆلکلۆری یەکانی ناو کلتوری کوردی و جیهانی بینیوە ، ئەم سوودبینینەش ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ بووە ، تەکنیکی شیعری ئەم ماوەیە بریتی یە لەوەی کە وەك مرۆڤ مامەلە لەگەڵ شتە بێ گیانەکان کراوە یاخود بە پێچەوانەوە لەگەڵ شتە بێ گیانەکاندا وەك مرۆڤ دواون ، هەرچەندە ئەم حالەتە بەشێوەیەکی تر لە شیعری گۆراندا دەبینرێت ، ئەم حالەتەش بریتی یە لەوەی کە شاعیر لە جیاتی ئەوەی پالەوانەکانی لە مرۆڤ دروست بکات ، پالەوانی دەقەکانی لە <u>شاخ</u> و <u>دەشت</u> و <u>ئاو</u> دروست دەکات ۰

پ/ پەیدابوونی دەنگی شاعیرانی ژن لەماوەی نێوان (**1970–1975**) چۆن بوو ؟

و/ دەنگی شیعری شاعیرانی ژن لەڕووپەڕی ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا دەبینرێن کە کاریگەری ئەم دەنگانە بە قۆناغی دواتری شیعری کوردی دەردەکەوێت کە بووە هەوێنی لەدایك بوونی گەلێك دەنگی زیندووی ژنە شاعیرانی کورد لە سالانی دواتردا ،لەوانەش وەك ( دایکی سۆلاف ، ئەرخەوان شەونم بەرزنجی ، دایا جوان ۰۰۰)

**2**– شیعری کوردی لەماوەی نێوان سالانی (**1975–1991**) :

پ/ لەماوەی نێوان (**1975–1991**) دا شیعر بووە هۆکاری چی ؟ پاشان چ شیعرێك بوژایەوە ؟

و/ شیعر بووە هۆکاری ڕەتکردنەوەی واقیع و زیندووکردنەوەی هۆشیاری نەتەوەیی و شان بەشانی تفەنگ لە دژی دوژمن لەسەنگەردا بووە ، چونکە نەدەکرا لەو سەردەمەدا کەسەردەمی بەرەنگاربوونەوە و لێپرسراوییەتی بوو شاعیران بێدەنگ بن ، بەڵکو دەبوو ڕۆلی

پێشڕەوی لە شۆڕشدا بگێڕن ، ئەمەش بووە هۆی دەوەی کەشیعر بەرەو بەرەنگاربوونەووەی ڕاستەوخۆ بچێت لە بیرومەبەستدا ، واتە جارێکی تر شیعری بەرەنگاری لە ئەدەبی کوردیدا بوژایەوە ۔

پ/ شیعری بەرەنگاری چی یە ؟ ئەو شاعیرانەی شیعری بەرەنگارییان دەنووسی لەچەند بەش پێکهاتبوون ؟ چ شاعیرێك شیعری بەرەنگاری نوسیوە ؟ بە نمونەی شیعرەوە وەلاّم بدەرەوە

و/ شیعری بەرەنگاری : بریتی یە لەو جۆرە شیعرە کە درێژە بە شەڕ دەدات و بەرەنگاردەبێتەوە و ڕەتدەکاتەوە و دەگۆڕێت و سەرلەنوێ بنیات دەنێتەوە ۔ وە ئەو شاعیرانەی کە شیعری بەرەنگارییان دەنووسی ئەمانە بوون :

1- ڕاستەوخۆ بەشداری شۆڕش بوون ۔

2- لەناوەوەی کوردستان بوون بەلاّم نارازی بوون لە دوژمن ۔

3- ئەو شاعیرانەی کە لە دەرەوەی کوردستان دەژیان ۔

نمونەی شیعری بەرەنگاری لەم شیعرەی (ئەنوەر قادر محەمەد) دا دەردەکەوێت :

خۆ من چەمە زستانە نیم ، هەر هاوین هات هەڵپڕوکێم

ئەستێرە نیم ، شەو نەبێ نەتوانم بفڕم

خۆریش نیم ، بە باڵەوە لە ڕۆژدا ئاسمان تەی کەم

چۆن کپ ئەبم !

پ/ ئایا ئەو واقیعە سیاسیە تاڵەی کورد کە لەدوای سالی 1975 توشی گەلی کورد هات توانی شیعری کوردی بەرەو ڕەشبینی ببات ؟ چۆن ؟ وەکو کام شاعیر؟

و/ نەخێر وای نەکردکە شیعری کوردی بەرەو ڕەشبینی بڕوات بەڵکو بەردەوام هیوای بە ئایندەیەکی گەش بووە ، هەربۆیەش شاعیرانی کورد بە چاوی ئومێدەوە بۆ ئایندەیان ڕوانیوە ، بە گەشبینییەوە ئاسۆی ڕووناکیان لە ئاسمانی کوردستاندا بینیوە ، (موئەیەد تەیب) کەلەم ماوەیەدا بە شێوەزاری کرمانجی ژوورو شیعری نوسیوە ، هیوایەکی زۆری بە پاشەڕۆژێکی مەزن هەیە ، زولم و زۆری دوژمن چۆکی پێ دانادات و سەربەرزانە دەڵێت :

سبە دایێ

پێلاڤا من

ژ تاجا میری بلندترە

داوەتا من

ژ هەمی گۆڤەندا خۆشترە

بەژنو بالاّ من

ژ بوهارێ ب خەملترە

ئەڤجا چاوا دێ کەی گری ؟

سینگی خۆیێ تەمەت دەریا

دێ ڤەقوتێ ؟

پرچا خۆ یاوەکی بەفرێ

دێ ڤە چڕی

نە دایێ نە !

نەکەی نەکەی

جلو بەرگێت خۆ ڕەش بکەی

دەرگە هێ کولکێ مەیێ خۆش

بۆ خەم و نیهارا ڤەکەی

پ/ ئەو دوو دەستە شاعیرە کێ بوون کەلەماوەی سالانی (**1975**ـ**1991**) شیعریان دەنووسی ؟

و/ أـدەستەیەکیان ئەو شاعیرانە بوون کە دەنگی دیاری ماوەی نێوان (**1970**ـ**1975**) بوون لەوانە(شێرکۆ بێکەس ، عەبدولڕەحمان مزوری ، ڕەفیق سابیر ، خەلیل دهۆکی ، ئەنوەر قادر جاف ، جەمال شارباژێڕی ، جەلال میرزا کەریم ، دلشاد مەریوانی ... )

ب- دەستەکەی تریان ئەوانە بوون کە دواتر لە شیعری کوردیدا شوێنی خۆیان گرت و بوونە دەنگێکی دیار لەوانە (ئەنوەر مەسیفی ، هاشم سەراج ، جەمیل ڕەنجبەر ، قوبادی جەلی زادە ، جەمال غەمبار ، موئەیەد تەیب ، سەعدوڵا پەرۆش ، کەریم دەشتی ، محمد عمر عوسمان ، فەرەیدون عەبدول بەرزنجی ...)

پ/ بەگشتی شیعری ماوەی نێوان (1975ـ1991) لەڕووی‌ناوەڕۆکەوە چۆن بوو ؟ یان پرسیارەکە بەم شێوازە

پ/ئەو بابەتانە چین کە شیعری بەرەنگاری لە سالانی (1975ـ1991) لە خۆی گرتبوو ؟

وەلام/ 1ـ شیعر دەبێتە هۆکارێك بۆ شکاندنی ترس لە دوژمن و بەرزکردنەوەی ورەی مرۆڤی کورد بەرامبەر بە دوژمن و بەخشینی هیواو ئومێدی سەرکەوتن بە خەلکی .

2- شیعر وەك هۆكارێكی بەهێزی ڕووناكبیری توانی بەشدارییەكی كارابێت لە بزوتنەوەی ڕزگاریخوازی گەلی كوردا و هاوكاری پێشمەرگە بووە لەسەنگەردا .

3- شیعری كوردی هەولی داوە لە ئاستی خەمی پڕ ناسۆری گەلەكەیدا بێت و ئەم كارەساتانە ببنە هەوێنی دەقە شیعرییەكان .

4- شاعیرانی كورد ویستیان لەڕێگەی شیعرەوە هاواری كورد بۆ ڕای گشتی بەرزبكەنەوە و داوایان لەگەلان ئازادیخوازی جیهان كردووە كە پالپشتی گەلی كورد بن لە پێناوی بەدەست هێنانی مافەكانیاندا .

پ / ئەو سێ توخمە سەرەكییەی كە لە شیعری بەرەنگاریدا بەكارئەهاتن چی بوون ؟

و / 1- پێشمەرگە وەك داینەمۆی شۆڕش . 2- شەهید وەك هێمای قوربانیدانی كورد .

3- كورد و كوردستانیش وەك مەڵبەندی ژیان و خاكی پیرۆزی نەتەوە .

شەهید ﴿جەمیل ڕەنجبەر ﴾ لەم ڕۆژگارەدا كە خۆی پێشمەرگە و شۆڕشگێڕ بوو بە نووكی خامە لەبەرواری ﴿29-12-1979﴾ لە مەیدانی بەرەنگاری دەنووسێت و بە ورەیەكی بەرز و گەشبینیەكی زۆرەوە دەڵێت :

ڕوبارێكی خوێناوی

ئەو بڕیارەی دروێنەی خەوی كردم

مەلی هەژار

لە فڕگەی ژان هەڵدەنیشێ

پێشمەرگەی لێ دادەبەزێ

هەرچی كانیاوی سەنگەرە

بۆ ڕووباری بەهار دەزێ

پ/ هەڵوێستی شیعری كوردی بەرامبەر بە سیاسەتی پاكتاوی نەژادی كورد لە سالآنی هەشتای سەدەی ڕابردوودا چۆن بوو ؟

و/ دوژمن دەستی دایە ئەنفال كردنی كورد و كیمیابارانكردنی هەڵەبجە و ناوچەكانی كوردستان ، ئەم كردەوانەی دوژمن بە قێزەونترین كاری جینۆساید دادەنرێت لە مێژووی هاوچەرخی كورد و ناوچەكە و جیهاندا ، هەر بۆیەش شیعری كوردی هەولی داوە لە ئاستی خەمی پڕناسۆری گەلەكەیدا بێت و ئەم كارەساتانە ببنە هەوێنی دەقە شیعرییەكان هەروەها ویستیان لە ڕێگەی شیعرەوە هاواری كورد بۆ ڕای گشتی بەرزبكەنەوە و داوایان لە گەلانی ئازادیخوازی جیهان كرد كە پالپشتی گەلی كورد بن لە بەدەست هێنانی مافەكانیدا .

ئەوەتا بۆ مەرگ بارانی هەڵەبجە ﴿جەوهەر کرمانج﴾ لە ساڵی ﴿1988﴾ بە نوکی خامەی شیوەن دەکات بۆ ئەم تاوانە کەم وێنەیەی

مێژووی مرۆڤایەتی و دەڵێت :

﴿هەڵەبجەی دووەم هاتن﴾

هەڵەبجە ... بێشکە و جۆلانەی

ئەحمەد مەختار و گۆران بوو

هەڵەبجە ...

جێگای نزرگەی ئاشقان بوو

هەڵەبجە تاجی سەروەری

شەهیدانی کوردستان بوو

هەڵەبجە ...

هەڵگری ئاڵای نەبەزینی

بیست و پێنج ملوێن ئینسان بوو

کە هەڵەبجە شەهید کرا

کوردستانی گەورە گریا

کە هەڵەبجە ... دە هەزار چاو

دە هەزار مەچەك و بازووی

بوون بە ئەڵقە و

داگیرکەر کردیانە پەنجە

ئەشکی چاوان بوو بە دەریا

ئاسمان گریا

زەوی گریا

دیوانی مەولەوی گریا

پ / شیعری کوردی لە ساڵانی (1975-1991) جگە لەو ڕۆحە بەرەنگارییەی کە پێی دەناسرێتەوە ، جوانترین شیعریشی بۆ چ مەبەستێکی تر نووسیوە ؟

و/ جوانترین شیعر بۆ ژن و مەبەستەکانی تر شیعر نوسراوە ، لە خاسیەت و سیمای تایبەتی وا نوسراون کەلەگەڵ ڕەوتی بەرەوپێشەوەچونی شیعری کوردی لە قۆناغەکەدا بگونجێنێ ، لەم لایەنەشدا دەنگی شاعیرانی وەکو (محەمەد عومەر عوسمان ، فەرەیدون عەبدول بەرزنجی ، قوبادی جەلی زادە ، دلاوەر قەرەداغی ، جەمال غەمبار ... ) دەبینرێت .

پ/ چوونەدەرەوەی شاعیرانی کورد بۆ دەرەوەی کوردستان چی کاریگەرییەکی لەسەر ئەدەبی کوردی بەجێهێشت ؟

و/ لە ئەنجامی چوونەدەرەوەی شاعیرانی کورد بۆ دەرەوەی کوردستان بەهۆی زەبروزەنگی دوژمنەوە ئەم شاعیرانە ئاشنابوون بەشیعری گەلانی تر ، ئەمەش زەمینەیەکی گونجاو بوو بۆ نزیك بوونەوە لە ڕۆشنبیری جیهان ، هەر ئەم تێکەڵاوبوونەش وای کرد کە شیعری کوردی لەم ماوەیەدا تا ماوەیەك کەوتە ژێر کارتێکردنی ئەدەبی ڕۆژئاوا .

پ/ هەستی گەڕانەوە بۆ خاکی کوردستان چ سیمایەکی لە شیعری ئەو شاعیرانەدا دروست کردبوو کە لەدەرەوەی کوردستان دەیان نووسی ؟ چ شاعیرێك شیعری بۆ ئەم مەبەستە نووسیوە ؟

و/ هەستێکی پڕ لەخۆشەویستییان بۆ کوردستان هەبووە ، بەتایبەتی هەستی گەڕانەوە بۆ خاکی پیرۆزی کوردستان لەدەقی شیعری ئەو شاعیرانەدا ڕەنگی داوەتەوە ، هەرئەوەش وادەکات کە بلێین یەکێك لە سیما دیارەکانی شیعری ئەم ماوەیە سەرهەڵدانی هەستی نامۆبوون و غەریبی شاعیرانە کە لەڕێی شیعرەکانیانەوە گەیاندۆتە کوردستان ، (عەبدوللا پەشێو) ئەو شاعیرەیە کەلە ساڵی (1978) دا شیعری (سەربازی ون) ی نووسیوە ، هەستی پڕتاسەی بەرامبەر خاکی کوردستان و ژمارەی زۆری شەهیدان دەردەبڕێت و دەڵێت :

کە وەفدێ دەچێتە شوێنێ

بۆ سەرگۆڕی سەربازی ون

تاجە گوڵینەیەك دێنێ

ئەگەر سبەی

وەفدێك بێتە وڵاتی من

لێم بپرسێ:

کوانێ گۆڕی سەربازی ون

دەڵێم :

گەورەم !

لە کەناری هەر جۆگەیێ

لەسەر سەکۆی هەر مزگەوتێ

لەبەردەرگای هەر ماڵێ

هەر کڵێسەیێ

هەر ئەشکەوتێ

لەسەر گا بەردی هەر شاخێ

لەسەر درەختی هەرباخێ

لەم وڵاتە :

لەسەر هەر بستە زەمینێ

لەژێر هەر گەزە ئاسمانێ

مەترسە کەمێك سەرداخە و

تاجە گوڵینەکەت دانێ !

مۆسکۆ – 1978/11/5

# ڕەخنەی ئەدەبی

پ/ وشەی ڕەخنە بەرامبەر بە چی بەکاردەهێنرێت ؟

و/ لە زمانی کوردیدا وشەی ڕەخنە بەرامبەر وشەی (نقد) ی عەرەبی و وشەی (کریتیک) ی ئینگلیزی بەکاردەهێنرێت .

پ/ لقەکانی لێکۆڵینەوەی بەرهەمی ئەدەبی کامانەن ؟

و/ ڕەخنەی ئەدەبی لە پاڵ مێژووی ئەدەب و تیۆری ئەدەبدا دەبنە سێ لقی لێکۆڵینەوەی بەرهەمی ئەدەبی واتە ڕەخنەی ئەدەبی لقێکی لێکۆڵینەوەی ئەدەبیەو بایەخ بە لێکۆڵینەوەی بەرهەمی ئەدەبی دەدات .

پ/ ئەرکی ڕەخنەی ئەدەبی چییە ؟

و/ ئەرکی ڕەخنەی ئەدەبی شیکردنەوە و ڕاڤەکردن و هەڵسەنگاندنی دەقی ئەدەبی یان دیاریکردنی بەهای دەقی ئەدەبی یە ، واتە ڕەخنەی ئەدەبی لەو بنەما هونەری و بیریانە دەکۆڵێتەوە کە دەقی ئەدەبییان لێ بنیات دەنرێ و بە شیوەیەکی زانستانە بەهای ئەو بنەمایانە دیاری دەکات ، بەمەش ڕادە و ئاستی گرنگی و بایەخی دەق بۆ خوێنەر و داهێنەریش دەستنیشان دەکات .

پ/ ڕەخنەگران چ کاریگەرییەکان هەیە لەسەر بەرهەمی ئەدەبی ؟

و/ ئەگەر ئەدیبان بەرجەستەکەری جوانی و ڕەنگ پێدەرەوە و ڕەنگ ڕێژکەری ژیان و دەروونی مرۆڤ بن ئەوا ڕەخنەگران بۆ خۆیان بزوێنەری چالاکی ئەدەبی و بزووتنەوەی ئەدەبی و داهێنانی ئەدەبین .

پ/ پێویستە ڕەخنەگر چۆن بێ ؟

و / 1- دەبێ ڕەخنەگر لێکۆڵەرێکی شارەزا بێت و زانیاری تەواوی دەربارەی مێژووی ئەدەب و تیۆری ئەدەبی میللەتەکەی و میللەتانی تر هەبێت .

2- چێژ لێوەرگرێکی ئەدەبیش بێ و دەبێت زانیاری لە بوارە جیاجیاکانی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەت ئابووری ڕۆشنبیریدا هەبێ.

3- شارەزاییەکی گشتی لە زانستە مرۆیی و زانستیەکاندا هەبێت .

## مێژوی ڕەخنەی جیهانی

پ/ لە مێژووی ڕەخنەی جیهانیدا کام ڕێڕەوی ڕەخنەییانە بەدی دەکرێن ؟ باسی بکە

و/ أ- ڕێڕەوی ڕەخنەی ڕۆژئاوایی / سەرەتای ئەم ڕێڕەوە ڕەخنەییە دەگەڕێتەوە بۆ پیش زایین و لەئەدەبی یۆنانییەوە دەستی پێکردووە .

ب- ڕێڕەوی ڕەخنەی ڕۆژهەلاتی / سەرەتای ئەم ڕێڕەوە ڕەخنەییە لە ئەدەبی عەرەبی سەردەمی (جاهیلی) یەوە دەست پێدەکات.

پ/ یەکەم هەنگاوی ڕەخنە لای یۆنانیەکان چۆن سەری هەڵداوە ؟

و/ یەکەم هەنگاوی لەم ڕێڕەوەدا کاتێ بەدی هاتووە کە لەکاتی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی جەژنەکانیانەوە شانۆگەرییان پێشکەش کردووە و لیژنەیەکیان بۆ هەڵبژاردنی باشترین دەقی تراجیدی یان کۆمیدی کە بەشیعر بووە دەستنیشان کردووە ، جا هەڵبژاردنی باشترین دەق لەلایەن ئەو لیژنەیەوەبۆ خۆی چالاکییەکی ڕەخنەیی بووە ، چونکە بە پێی چەند پێوانەیەکی هونەری و بیری دەقەکانیان هەڵبژاردووە .

پ/ یەکەم هەنگاوی ڕەخنە لای یۆنانیەکان کەی سەری هەڵدا ؟ لای کێ ؟ ناوی بەرهەمەکە چی بووە ؟

و/ لەسەدەی پێنجی پێش زایین شاعیرێکی یۆنانی کەناوی(ئەرستۆڤانیس) بووە لەبەرهەمێکی کۆمیدی خۆیدا بەناونیشانی (بۆقەکان) ڕاوبۆچوون و تێڕوانینی ڕەخنەیی دەربارەی شاعیری گەورەی یۆنانی خستووەتە ڕوو ، ئەو دوو شاعیرەش (یۆربیدز و ئەسخیلۆس ) بوون .

پ/ دیارترین ئەو فەیلەسوفانە کێ بوون کە ڕێچکەی ڕەخنەی ئەدەبییان لای یۆنانییەکان کردەوە ؟ بیروڕای هەر یەکێکیان دەربارەی شیعر چۆن بووە ؟ باسی بکە

و/ دیارترینی ئەو فەیلەسوفانە (ئەفلاتون) و (ئەرستۆ) بوون

(ئەفلاتوون) ڕای وابووە کە شاعیران ناتوانن ڕاستیەکان بگەیەنن بە خەڵکی و لەبری ئەوەی چاکەیان فێربکەن ، هەڵیان دەخەڵەتێنن و دەروونیان تێکدەدەن و وایان لێدەکەن کە جڵەو بدەنە دەست هەست و سۆزیان نەك ئەقڵیان .

(ئەرستۆ) بە پێچەوانەی ئەفلاتونەوە بەرهەمی شیعری بەسوودمەند داناوە بەتایبەتی تراجیدیا ، کەبەلایەوە دەتوانێت دەروونی بینەر لەهەردوو هەست و سۆزی ترس و بەزەیی پاك بکاتەوە .

پ/ هونەری شیعر بەرهەمی کێیە؟ ناوەڕۆکەکەی باسی چی دەکات ؟

و/ ئەرستۆ لەبەرهەمەکەیدا کە بەناونیشانی (هونەری شیعر) ە کۆمەڵێ دەستوور و یاسای هونەری بۆ تراجیدیا داڕشتووە کە بونەتە بناغەی تیۆری ڕەخنەی ئەوروپی بەگشتی و بنەمای ڕەخنەی کلاسیکی نوێ کاتێ وەك ڕێبازێکی ئەدەبی لەسەدەی حەڤدەدا لە فەڕەنسا سەری هەڵداو گەشەی کرد .

پ/ چ ڕەخنەگرێك ڕا و بۆچونەکانی (ئەرستۆ) ی جێگیرکرد؟ کردنیە پێوانەی چی ؟

و/ ڕەخنەگری بەناوبانگی فەڕەنسی (بوالۆ) ڕا و بۆچوونەکانی (ئەرستۆ) ی جێگیرکرد و کردنیە پێوانەی ڕەخنەی کلاسیکی نوێ لە

ئەوروپا ، هۆی ئەمەش ئەوەبوو کە ڕبازێکی کلاسیکی بۆ خۆی لە ئاکامی بووژانەوە و لاسایی کردنەوەی بەرهەمی یۆنانییەکان و ڕۆمانییەکان سەری هەڵدا .

پ/ گرنگترین بنەما و پێوانەی ڕەخنەی کلاسیکی نوێ بریتی بوون لەچی ؟

و/ 1- جڵەو دانە دەست ئەقڵ و ژیری و دوورکەوتنەوە لەهەست و سۆز و دەربڕینی کەسی .

2- بایەخدان بە چێژی دروست و گرنگی دان بە بەها مرۆڤایەتییە گشتیەکان .

3- گرنگی دان بە ئەرك و ئامانجی شیعر و دەرخستن و پیشاندانی لایەنی چاك و بەرزی ژیان لە تراجیدیاکاندا .

4- ڕووکردنە ئەو بابەتانەی کە چارەنووسی مرۆڤیان تیا بەرجەستە دەکرێت .

پ/ گرنگترین پێوانە ڕەخنەییەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکی چییە ؟

و / 1- بایەخدان بە هەست و سۆزی کەسی و دوورکەوتنەوە لە ئەقڵ .

2- گرنگیدان بەو بەهایانە کە کەسین و بەلای تاکە کەسەوە گرنگن .

پ/ ئەلفرێد دی مۆسێ و بوالۆ سەر بە چ ڕێبازێکی ئەدەبین ؟ جیاوازی چییە لە نێوان بۆچوونەکانیان دە ربارەی ئەقڵ؟

و/ ئەلفرێد دی مۆسێ کە نوسەرێکی ڕۆمانتیکی فەڕەنسی یە دەڵێ : ( ئەوەی گرنگ بێت بەلای منەوە ئەوەیە کە گوێ نەدەمە ئەقڵ) ، لە کاتێکدا کە (بوالۆ) ی ڕەخنەگری کلاسیکی بوو وتویەتی : ( هەمیشە بە دەنگ ئەقڵەوە بچۆ و لەوەوە یەکێتی بەرهەمەکانت بەدەست بهێنە).

پ/ دیارترین ڕەخنەگرەکانی ڕێبازی ڕۆمانتیکی کێن ؟ چۆن لەدەقی ئەدەبییان ڕوانیووە ؟

و/ دیارترین ڕەخنەگری ڕێبازی ڕۆمانتیکی 1- (مادام دی ستال) کەبەلایەوە (دەبێ دەقی ئەدەبی ڕەنگ پێدەرەوەی ژیانە کۆمەڵایەتی و خووڕەوشت و نەریتی کۆمەڵ) بێت . 2- (سانت بیف) کە بەلایەوە (دەقی ئەدەبی ڕەنگ پێدەرەوەی هەست و سۆزی نووسەرە ، هەربۆیە دەبێ ڕەخنەش تیشك بخاتە سەر دەروونی نووسەر و ناخی نووسەرمان بۆ ڕۆشن بکاتەوە) .

پ/ لەدوای ڕێبازی ڕۆمانتیکی کۆمەڵێ ڕێبازی تری ئەدەبی سەریان هەڵدا چی بوون ؟

و/ وەك ڕێبازی (ڕیالیزمی و پڕناسی و هێماگەریی و فۆرمالیزمی ....هتد ) لەپاڵ ئەم ڕێبازە ئەدەبییانەشدا چەند ڕێبازێکی ڕەخنەیی هاتنە کایەوە کە گرنگترینیان ڕێبازەکانی (شیکاری دەروونی و مارکسی و شێوەگەرایی و بنیات گەری) بوون .

پ/ بەگشتی ڕەخنەی نوێ لە ئەدەبی ئەوروپی پێ لەسەر چی دادەگرێت ؟

و/ بەگشتی ڕەخنەی نوێ لەئەدەبی ئەورووپی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە دەبێ پێوانە ڕەخنەییەکان بابەتی بن و لەبازنەی تێڕوانینی کەسی ڕەخنەگردا نەهێلرێتەوە و ڕاستەوخۆ لە سروشتی دەقی ئەدەبی خۆیەوە بەدەست بهێنرێن .

## ڕەخنەی ئەدەبی ڕۆژهەلاتی (عەرەبی ئیسلامی)

پ/ سەرەتای ڕەخنەی عەرەبی ڕۆژهەلاتی چۆن دەستی پێکردووە ؟ بەناوبانگترین شاعیری ڕەخنەگر لەو سەردەمەدا کێ بوو ؟ پێوانە ڕەخنەییەکانی چۆن بوون ؟

و/ سەرەتای ئەم ڕێرەوە لەئەدەبی عەرەبی سەردەمی جاهیلی یەوە دەست پێدەکات ئەوەش کاتێ کەهۆزە عەرەبەکان ساڵانە لە بازاڕی (عوکاز) لە نزیك مەککە کۆدەبوونەوە و شاعیرانی هەر هۆزێك بەرهەمی خۆی بۆ شاعیری گەورەی ئەو کاتە کەناوی (نابیغە ئەل زوبیانی ) بووە خوێندووەتەوە کە ئەویش وەك دادوەرێکی ئەدەبی و ڕەخنەگرێك ڕاوبۆچونی خۆی دەربارەی دەقە شیعرییەکان خستووەتەڕوو ، پێوانە ڕەخنەییەکانیش زیاتر هونەری بوون و لەدەوری وشە و واتای جوان و گونجاو و شیاو و شایستە سووڕاونەتەوە .

پ/ پاش بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام پێوانە ڕەخنەییەکان چۆن بوون ؟

و/ پاش بلاوبوونەوەی ئاینی ئیسلام پێوانە ڕەخنەییەکان لە ڕێنماییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە بەدەست دەهێنران و لە ڕوانگەی باوەڕی ئاینی شاعیرەوە لەدەق ڕۆنراوە و داوادەکرا کە شاعیران دەبێ پەیامدار بن و بەرهەمەکانیان لە خزمەتی کۆمەڵگا ئیسلامییەکەدا بێت .

پ/ بۆچی لەسەردەمی عەباسییەکاندا پێوانە ڕەخنەییەکان فراوانتربوون ؟ چ تێڕوانینێکی نوێ پەیڕەوکراوە ؟ ئەو ڕێڕەوە ڕەخنەییەکەی گەشەی کردووە ؟

و/ بەهۆی تێکەڵاوبوونی ڕۆشنبیری گەلە موسولمانەکانەوە بەهۆی ئاگاداربوون لە ئەدەب و ڕەخنەی یۆنانی بە تایبەتی (هونەری شیعر) مکەی ئەرستۆیە ، پێوانە ڕەخنەییەکان فراوانتربوون و بەرەو بایەخدان بەلایەنی هونەری براون و زیاتر ئەو تێڕوانینە ڕەخنەییە پەیڕەو کراوە کەبەلایەوە دەقی شیعری چنراوێکی زمانییە و دەبێ شاعیر بایەخ بدات بەلایەنی جوانکاری دەقەکە بدات ، وەلەسەدەی نۆزدی بەدواوە ئەو ڕێڕەوە ڕەخنەییە بەسوود وەرگرتن لە ڕیبازە ڕەخنەییەکانی ئەدەبی ئەورووپی گەشەی کردووە و ئاوێتەی ڕێبازە ڕەخنەییە جیهانییەکان بووە .

## ڕەخنەی ئەدەبی کوردی

پ/ بۆچی چالاکی و بەرهەمی ڕەخنەییمان لەچاو بەرهەمی شیعریدا کز و لاواز دەبینرێت ؟

و/ چونکە تائیستاش وتار و لێکۆڵینەوەی ڕەخنەیی پێش سەدەی بیستەممان دەست نەکەوتووە و ئەو بەرهەمە ڕەخنەییانەی کەهەن مێژووەکەیان دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی بیستی سەدەی ڕابردوو بەدواوە ، کە ڕۆژنامەگەری کوردی تیایدا بەرەو گەشەسەندن چووە و چاپەمەنی کوردیش بەرەو پێش هاتووە.

تێبینی :لەگەڵ ئەو دیاردەی کزی و لاوازییەی ڕەخنەی کوردیشدا دەکرێ ئەو ڕاستییە بخەینە بەردەست کە لە قۆناغە جیاجیاکانی شیعری کوردی پێش سەدەی بیستەمدا چالاکی ڕەخنەیی لە ئارادا بووە و شاعیرانی کورد خۆیان لەبەرهەمە شیعرییەکانیاندا تێڕوانین و بۆچونی ڕەخنەییان خستووەتە بەردەست و دەستنیشانی کۆمەڵێ پێوانەی ڕەخنەییان کردووە .

### مەلای جزیری

پ/ مەلای جزیری وشەی ڕەخنەی بە چ واتایەك بەکارهێناوە ؟ چ بنەمایەکی ڕەخنەیی دەست نیشان کردووە ؟ باشترین شیعر چ شیعرێکە؟

و/مەلای جزیری کۆمەڵێ باسی ڕەخنەیی وروژاندووە، وشەی ڕەخنەی بەو واتایە بەکارهێناوە کە ئێستا بەکاری دەهێنن ،هەروەها کۆمەڵێ زاراوەی ڕەخنەیی بەکارهێناوە کە هەریەکەیان تایبەتن بە چەند پێوانەیەکی ڕەخنەی شیعری وەك

﴿نەزمی لەتیف﴾ و ﴿سفك﴾ و ﴿ئەشکال و ئەوزاعێن بەدیع﴾ ، مەلای جزیری لەم هۆنراوەیەدا ئەو بنەما ڕەخنەییە دەستنیشان دەکات کە بەلایەوە ﴿باشترین شیعر ئەو شیعرەیە کە وشەکانی جوان و چێژ بەخش و ڕەوان بن و واتاکانیشیان سوودبەخش بن﴾

ئەحسەن ژ ڤی وەسفێ ڕەفیع ئەشکال و ئەوزاعێن بەدیع

تێتن ژ نورێ وەك ڕەقیع بێ عەیب و نەقس و ڕەخنەدا

پ/ ئەحمەدی خانی لە کاتی ڕەخنەگرتندا داوای چی دەکات لە ڕەخنەگران؟ خانی دەقی شیعری بە چی چواندووە ؟بە نمونەی شیعری باسی بکە

و/ لێرەدا خانی ئەو ڕاستیە دەخاتە بەردەست کە دەقی شیعری لە دوای لەدایکبوونی لە لایەن ڕەخنەگرانەوە ڕەخنەی لێدەگیرێت بۆیە ئەمیش داوا لە ڕەخنەگران دەکات کە لەکاتی ڕەخنەگرتندا ڕەنج و ماندووبونی شاعیریان لەبەرچاو بێت و ئەگەر کەم و کوڕیەکیش هەبوو ئەوا نەیکەنە بەهانە و بەیەکجاری دەقەکە بەبێ سوود و بێکەڵك دانەنێن ، چونکە هەموو دەقێك کە ڕەسەن بێت

و دزراو نەبێت وەك ڕۆلەی شاعیر وایە و لای شاعیر خۆشەویستە ، کەسیش پێی خۆش نیە بە خراپی لە مندالەکانی بڕوانرێ ، بەو تێڕوانینە خانی ئاوڕی لە باسێکی گرنگ داوەتەوە کە کێشەی داهێنانە ، بۆیە خانی دەڵێت :

لی هێڤی دکەم ژ موستەعیدان حەرفان نەگرن ل موستەفیدان

ئەڤ نامە ئەگەر خراپە گەر ڤنج کێشایە مە دگەل وی دوو سەد ڕەنج

پ/ خانی چۆن باسی کورت بڕی کردووە لە دەقی شیعریدا ؟

و/ لێرەدا خانی باسێکی گرنگی ڕەخنەیی دەوروژێنێت کە ئەویش باسی کورت بڕی یە لەدەقی شیعریدا بۆ خۆی تائەمڕۆش پێوانەیەکی ڕەخنەی شیعریەوە ، هەمیشەش داوا لە شاعیران کراوە کە هەولبدەن بە کەمترین وشە زۆرترین واتا بدەن بە دەستەوە ، وەك لەم دوو دێڕەدا دەڵێت :

ئەی خامە تەژی گەلەك درێژکر ئەڤ نامە بەسە تەپڕ قرێژکر

هەرچەندە کەلام شوبهی دوربەت بێ قەدر دبت دەما کو پڕ بەت

## نالی

پ/ چۆن نالی شاعیر دەست نیشانی کۆمەڵێ پێوانەی ڕەخنەیی کردووە ؟

و/ نالی کۆمەڵێ پێوانەی ڕەخنەیی خستووەتەڕوو کە لەبنەما گرنگەکانی ڕەخنەی ئەدەبی سەردەمەکەی بوون وەك :

کەس بەئەلفازم نەڵێ خۆ کردی یە خۆ کوردی یە

هەر کەسێ نادان نەبێ خۆی تالبی مەعنا دەکا

نالی ڕوودەکاتە ئەو کەسانەی کە ڕەخنەیان لێگرتووە و توانجی ئەوەیان لێ داوە کە شیعر بە زمانی کوردی دەڵێ و شیعری کوردیش بەهرەو هونەرمەندی تیادانییە ، پێیان دەڵێ هونەرمەندی لەوەدایە کە چۆن توانیویەتی بە زامنی کوردی ئەو واتا جوان و ناسکانە دەرببڕێ ، بەم پێیەش (نالی) لێرەدا بەو پێوانە ڕەخنەییە (وشە و واتا)ی شیعری هەڵسەنگاندووە کە بەلایەوە بەهای دەق واتای جوان و نوێیە نەك هەر بەتەنها وشە و واژەی جوان و ڕازاوە ، لەبەیتێکی تردا نالی دەڵێت :

نالی عەجەب بە قووەتی حیکمەت ئەدا دەکا

مەعنایی زۆر و گەورە بەلەفزی کەم و بچووك

کەواتە لێرەدا (نالی)یش وەك ئەحمەدی خانی دەستنیشانی ئەو بنەڕەتە ڕەخنەییە دەکات کە بەلایەوە شیعری جوان و بەهادار ئەو شیعرەیە کە بەکەمترین وشە زۆرترین واتای دەربڕیوە .

## سالم

پ/ سالمی شاعیر چ بنەڕەتێکی ڕەخنەیی دەستنیشان کردووە ؟ بەنمونەی شیعری باسی بکە

و/ سالم بەو چەشنە شانازی کردنە بەتوانای شیعری خۆیی و شاعیرانی هاوڕێیەوە پەردە لەسەر ئەو ڕاستیە هەڵدەداتەوە کە بنەڕەتێکی گرنگی ڕەخنەیی لەو قۆناغە ئەدەبیەدا ، توانای بەکارهێنانی هونەرەکانی ڕەوانبێژی عەرەبی بخەنە ژێر ڕکێفی خۆیان و بە زمانی کوردی لە مەیدانی ئەو زانستەدا ببنە سوارچاکی سەردەمەکەیان ، وەك لەم باریەوە دەڵێ :

لە ڕۆژی ئیمتیحانا دیم بە رابەر تالیب و مەعشووق

کەمەربەستەی هونەر هاتن لە تیپی عیشق بازانا

لەیەم لا نالی و مەشوی لەلایێ سالم و کوردی

لەهەنگامەی هونەر گەرمی تکا جوبوون لە مەولانا

## حاجی قادری کۆیی

پ/ چۆن حاجی قادری کۆیی ئاوڕی لە چالاکی ڕەخنەیی سەردەمەکەی داوەتەوە ؟ بەلای ئەوەوە دەبێت ڕەخنەگر چۆن بێت ؟بە نمونەی شیعری باسی بکە

و/ ڕەخنەگر دەبێت کەسانی شارەزا و بەتواناین چونکە هەموو کەسێك ناتوانێت ببێتە ڕەخنەگر ، حاجی قادر بە (سەڕافی زێڕ و زیوی قسە) ناویان دەبات ، لەلایەکی تریشەوە بە پشت بەستن بە پێوانەیەکی ڕەخنەیی ئەو سەردەمە کە پێوانەی ڕەوانبێژی و ڕوونبێژی بووە ، بەهای شیعری کوردی دیاری دەکات و شانی پێ لە شانی شیعری فارسی دەدات و دەڵێت :

شەبیهی جۆلا کە زاری نەبێ بەسەر دڕی خۆی

مەلێن فەساحەتی کوردی بە فارسی ناگا

بەلاغەتێکی هەیە هیچ زوبانێ نایگاتێ

لە بێ تەعەسوبی کوردانە بێ ڕەواج و بەها

## ڕەخنەی ئەدەبی کوردی لەدوای جەنگی یەکەمی جیهانی

پ/ چالاکی و پێوانە ڕەخنەییەکانی ئەدەبی کوردی کەی و چۆن گەشەی کردووە ؟

و/ چالاکی و پێوانە ڕەخنەییەکانی ئەدەبی کوردی لەدوای جەنگی جیهانی یەکەم و لەگەڵ سەرهەڵدان و بەرەو پێشچوونی چاپەمەنی کوردییدا گەشەیان کرد و بەرەو پێش چوون و بەرفراوانتربوون .

**پ/ یەکەم بەرهەمی مێژوویی ڕەخنەی ئەدەبی کوردی چی بوو ؟ باسی چی دەکات ؟**

**و/ کتێبەکەی ﴿ئەمین فەیزی بەگ﴾ ە کە لە ساڵی ﴿1920﴾ دا بەناونیشانی ﴿ئەنجومەنی ئەدیبان﴾ لەئەستەمبول چاپ کراوە ، لەو کتێبەدا بەکورتی باس لە ژیانی چەند شاعیرێکی کورد کراوە ، نموونە لە شیعرەکانیان خراوەتە بەردەست ، بەم پێیە ئەو کتێبە دەچێتە خانەی مێژووی ئەدەبەوە نەک ڕەخنەوە ۔**

**پ/ چۆن مەولەوی لە ڕێکخستنی سەروادا داهێنانی کردووە ؟**

**و/ مەولەوی لە ڕێکخستنی سەروادا داهێنانی کردووە ، کاتێ لە چوارینێکدا سەروای دێڕی یەکەم و سێیەمی هاوسەروا کردووە و دێڕی دووەم و چوارەمیشی بە سەروایەکی تر هاوسەروا کردووە ، ئەم چەشنە بەکارهێنانی سەرواشی لە شیعری هیچ میللەتێکەوە وەرنەگرتووە بەڵکو خۆی دای هێناوە ۔**

**پ/ شێخ نوری شێخ سالح کەی و لەکوێدا زنجیرەیەك لێکۆڵینەوەی بلاوکردۆتەوە ؟ ئەو لێکۆڵینەوانە دەچنە چ خانەیەوەکەوە ؟ ڕوونی بکەرەوە**

**و/ شیخ نوری شێخ سالح سالی ﴿1926﴾ لە ڕۆژنامەی ﴿ژیانەوە﴾دا بەزنجیرە لێکۆڵینەوەیەکی دەربارەی ئەدەب بەگشتی و شیعر بەتایبەتی بلاوکردووەتەوە ، لەگەڵ ئەوەی ئەو لێکۆڵینەوەیە زیاتر دەچێتە خانەی تیۆری ئەدەبەوە بەلاَم لەو باسانەیدا کە دەربارەی ﴿جوانی﴾ دەقی ئەدەبیە لە تیۆری ڕەخنەی ئەدەبی نزیك دەبێتەوە بەتایبەتی لەو باسەیدا کە جیاوازی نیوان زمان و شێوازی ئاخاوتنی ڕۆژانە و شێوازی زانستی و شێوازی ئەدەبی دیاری دەکات ۔**

**پ/سیاپۆش لەساڵی چەند وتارێکی بەناوی شاعیرەکانمان بلاَوکردۆتەوە؟ وتارەکە دەچێتە چ خانەیەکی ئەدەبی ؟ باسی بکە**

**و/ سیاپۆش لە سالی ﴿1932﴾ دا بەرهەمێکی بە ناونیشانی ﴿شاعیرەکانمان﴾ بلاَوکردۆتەوە ، ئەم وتارەش نەك هەر ڕاستەوخۆ دەچێتە خانەی ڕەخنەوە بەلکو دەرگایەکی نوێش لەبەردەم ئەدەب و ڕەخنەی ئەدەبی کوردی دەکاتەوە و وشیارانە دەیەوێ سیمایەکی تازە بە ئەدەبی کوردی بپۆشێ و بەرگێکی نوێ بکاتە بەر ڕەخنەی ئەدەبی کوردی ۔**

**پ/﴿گوڵ دەستەی شوعەرای هاوعەصرم﴾ کتێبی کێ یە ؟ سالی چەند بلاَوکرایەوە ؟ ئەم کتێبە دەچێتە چ خانەیەکەوە ؟بۆچی؟**

**و/ ﴿گوڵ دەستەی شوعەرای هاوعەصرم﴾ کتێبی ﴿عەلی کەمال باپیرە﴾ سالی 1939 بلاَویکردۆتەوە ، ئەم بەرهەمە دەچێتە خانەی مێژووی ئەدەبەوە نەك ڕەخنەی ئەدەبییەوە چونکە بەکورتی باس لە ژیانی چەند شاعیرێکی کوردی هاوچەرخ دەکات و نمونەی شیعرەکانیان دەخاتە بەردەست ۔**

**پ/ ڕەخنە لەگۆڤاری ﴿گەلاوێژ﴾ دا چۆن بوو ؟ ئەو وتارانە چۆن بوون ؟ چ نووسەرێك ڕەخنەی گرتووە ؟**

**و/ لەگەڵ بلاوبونەوەی گۆڤاری ﴿گەلاوێژ﴾ دا ، زەمینەیەکی لەبارڕەخسا بۆ وتاری ڕەخنەیی و کۆمەڵێك نووسەر لەبواری پراکتیکدا**

کۆمەڵێك وتاری ڕەخنەییان بلاوکردووەتەوە ، بێگومان ئەم وتارانەش لەئاستی جیاجیابوون و زۆرجار بۆ خۆیان بوونەتەوە جێگای ڕەخنەلێ گرتن ، هەروەك لەو وتارەی (جەمیل بەندی ڕۆژبەیانی) دا دەردەکەوێت .

پ/ لەسالانی چلەکاندا چ بەرهەمێکی ئەدەبی کەوتە بەردەستی خوێنەران؟ خاوەنەکەی کێیە ؟ باسی چی دەکات؟

و/ لەچلەکانی سەدەی ڕابردوودا بەرگی یەکەمی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) ڕەفیق حیلمی کەوتە بەردەستی خوێنەران ، ئەگەر چی ئەم بەرگەی زیاتر دەچێتە خانەی مێژووی ئەدەبەوە بەلام لەهەندێ شوێندا ڕا و بۆچۆنی ڕەخنەیی دەربارەی شاعیرەکان خستووەتە بەردەست.

پ/ سالی 1952 چ بەرهەمێکی ئەدەبی کوردی بلاوکرایەوە ؟ خاوەنەکەی کێیە ؟ بەهۆی چییەوە بلاوبۆوە ؟گرنگی ئەم کتێبە لەچی دایە ؟

و/ لە سالی(1952) دا کتێبی مێژووی ئەدەبی کوردی عەلائەدین سوجادی بلاوبووەوە، بەهۆی فراوانبوونی ئاسۆی بەردەم ئەدەبی کوردی ڕەخنەی ئەدەبی بواری چاکتری لەبەردەمدا کردنەوە ، گرنگی ئەم کتێبەش لەوەدایە :

1- خوێنەری کورد زیاتر ئاشنای شیعر و شاعیرانی نەتەوەکەمان بوون .

2- بواری هەڵسەنگاندن و تێڕوانینی ڕەخنەیی زیاتر لەبەردەمدا کردنەوە .

پ/ لەسالی 1956 دا چ بەرهەمێکی ئەدەبی کوردی بلاوکرایەوە ؟ خاوەنەکەی کێیە ؟ گرنگی لە چیدایە ؟

و/ لە سالی 1956 دا بەرگی دووەمی (شیعر و ئەدەبیاتی کوردی) ڕەفیق حیلمی بلاوکرایەوە ، گرنگی ئەم بەرهەمەش لەوەدایە لەپاڵ باسی ژیان و شیعری دەستەیەك لە شاعیرانی کوردا ، کۆمەڵێك ڕاو بۆچوونی ڕەخنەیی وردی دەربارەی ئەم شاعیرانە خستووەتە ڕوو وەك ئەم تێڕوانینەی کە دەربارەی (گۆران) ی شاعیرە .

پ/ ڕەخنە چۆن بووە لە گۆڤاری (شەفەق) دا ؟ باسی بکە و ئەو وتارو لێکۆلینەوانە کامانەن کەلەم گۆڤارەدا بلاوکراونەتەوە؟

و/ گۆڤاری (شەفەق) لەشاری کەرکوك سالی 1958 دەرچووە ، بەو وتا رە ڕەخنەییانەی کەلەم گۆڤارەدا بلاوکراونەتەوە ڕەخنەی ئەدەبی گەشەسەندنێکی دیاری بەخۆیەوە بینیوە چونکە وتارە ڕەخنەییەکانی وردتر و زانستیانەتربوون و جێگای بایەخ پێدانی ئەدەب دۆستان بوون ، هەر بۆیەش دەبینین کە نوسەرانمان لەسەر لاپەڕەی ئەو گۆڤارە کەوتوونەتە ئالوگۆڕکردنی ڕا و بۆچوونی ڕەخەییان دەربارەی هەندێك باسی ئەدەبی و دەربارەی شیعری شاعیرانی ئەو سەردەمە وەك لەم وتارانەدا دیارە :

1- وتاری (کامەران و دیارییەکە) ----> مارف بەرزنجی

2- وتاری (کۆن و تازە لە شیعردا) ----> مارف بەرزنجی

3- وتاری( کورد و شیعر) ی هەستان ----> مارف خەزنەدار

4- وتاری( کورد و ئسلوبی شیعر) -----> مارف خەزنەدار

5- وتاری(شیعر و نوسینی کوردی) -----> ڕەفیق حیلمی

پ/ دوای شۆڕشی 14ی گەلاوێژ (1958) چەند لێکۆلینەوەیەکی ڕەخنەیی بلاوکرانەوە کامانەن ؟

و/1- لێکۆلینەوەی (حسێن عارف) کەبەناوی (محمد سدیق عارف)و بە ناونیشانی (کامەران و هۆنراوەی نوێ)بلاوکرایەوە.

2- لێکۆلینەوەیەکی (محمدی مەلا کەریم) دەربارەی (حاجی قادری کۆیی).

3- لێکۆلینەوەیەکی (کامیل حەسەن بەصیر) بەزمانی عەرەبی و بە ناونیشانی (کامران شاعر من کردستان).

پ/ کردنەوەی بەشی کوردی لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا ڕەخنەی ئەدەبی کوردی چۆن بوو ؟

و/ بەکردنەوەی بەشی کوردی لە کۆلیژی ئادابی زانکۆی بەغدا و بوونی بابەتی ڕەخنە لە پرۆگرامی خوێندنی ئەو بەشەدا و وتنەوەی ئەو بابەتە بۆ ماوەیەك لەلایەن(گۆران)ی شاعیرەوە ڕەخنە سیما و شەقلێکی گەشتر و زانستییانەتری وەرگرت.

پ/ لە ناوەڕاستی شەستەکاندا بەهۆی چییەوە ڕەخنەی ئەدەبی کوردی هەنگاوی نوێی بەرەوپێشچوونی بۆ ڕەخسا ؟

و/ بەهۆی ئامادەکردنی کۆمەلێ نامەی ئەکادیمی لەلایەن ئەو خوێندکارانەی کەلەدەرەوەی عێراق بڕوانامەی دکتۆرایان لەئەدەبی کوردیدا بەدەست هێنابوو ، ڕەخنەی ئەدەبی هەنگاوێکی نوێی بەرەو پێش چوونی بۆ ڕەخسا ، کەئەم نامانەن :

1- (ڕیالیزم لەئەدەبی کوردیدا)نامەی دکتۆرای (د.عیززەدین مستەفا ڕەسول)ە .

2- (کورتەی مێژووی هاوچەرخی ئەدەبیاتی کوردی) نامەی دکتۆرای ( د. مارف خەزنەدار)ە .

3- (حاجی قادری کۆیی- ژیان و بەرهەمی) نامەی دکتۆرای (دزئیحسان فوئاد)ە .

پ/ لە سالی (1975) ڕەخنەی ئەدەبی چۆن بوو ؟ سیمای دیاری سالانی هەشتای ئەدەبی کوردیمان چۆن بوو ؟ باسی بکە

و/ لەدوای سالی (1975) ئەگەر چی تاڕادەیەك ئەدەب و ڕەخنەی کوردیش وەك شۆڕشەکەی تووشی جۆرە نووشستیەك بوو بەلام خۆڕاگری و چۆك دانەدانی ئەدیبان و نووسەرانی کورد نەك هەر بووە هۆی ئەوەی کەبەرهەمی ئەدەبیمان بەردەوام بێت وبەزیندویی بمێنێتەوە بەلکو خولیای داهێنان و هەنگاو نان بەرەو پێش چوون ببوو بە سیمای دیاری سالانی هەشتای ئەدەبی کوردیمان ، دیارە ڕەخنەش لەو خولیایە بێبەش نەبووە و کەم تا زۆر نوسەرانمان لە پێناو گەشەدان بە ئەدەبەکەمان تێڕوانینی ڕەخنەیی خۆیان بلاوکردۆتەوە .

پ/ لە سالی 1970 دا ڕۆلی بزوتنەوەی ڕوانگە چی بوول ە بواری ڕەخنەدا؟

و/ لەگەلێ سەرهەلدانی بزوتنەوەی ڕوانگەدا ئاسۆیەکی نوێ لەبەردەم چالاکی و جم و جۆلی ڕەخنەییدا کرایەوە و لە پالێ بەرهەمی بلاوکراوەی نوسەرانی سەر بەو بزوتنەوەیەدا کۆمەلێ وتاری ڕەخنەییش دەربارەی بزوتنەوەکە خۆی و دەربارەی بەرهەمە

ئەدەبییەکان بڵاوکرانەوە ، بەم پێیە خودی بزوتنەوەی ڕوانگە بوارێکی نوێ و فراوانی لەبەردەم ڕەخنەشدا کردەوە.

## پەخشان

پ/ پەخشان چی یە؟ جۆرەکانی بژمێرە و باسیان بکە ؟

و / پەخشان : بریتی یە لەو دەربڕین ونووسراوانەی کە هەست و سۆزی مرۆڤ نیشان دەدات .

پەخشانی نوێ بەگشتی بایەخ بە کێش و سەروا نادات

جۆرەکانی پەخشان : بەشێوەیەکی گشتی پەخشان دەکرێت بەم جۆرانەوە :

1- پەخشانی زانستی : ئەو پەخشانەیە کەباس لە بابەتێکی زانستی دەکات و بایەخ بە هەست و سۆز نادات ، وەك بابەتەکاتی ( کیمیا ، فیزیا ، پزیشکی ، بیرکاری ... )

2- پەخشانی ئەدەبی : ئەو پەخشانەیە کەزیاتر بایەخ بە هەست و سۆز دەدات بۆ ئەوەی کە کار لەبەرامبەرەکەی بکات و چێژی پێببەخشێ ، وەکو ( وتاری ئەدەبی ، چیرۆك ، یاداشت ، نامە، ژیاننامە ، وەرگێڕانی ئەدەبی ، وتووێژەئەدەبیەکان ... )

## وتار

پ/ وتار چییە ؟ گرنگترین خاسیەتەکانی وتار چین ؟ بیانژمێرە

و / وتار : هونەرێکی ئەدەبییە ، نووسەر بەشێوەیەکی کورت و ورد و سەرنج ڕاکێش لایەنێکی ژیان باس دەکات و بیروڕای خۆی دەخاتە ڕوو .

خاسیەتەکانی وتار ئەمانەن :

1- کورتی ، دەبێت وتار لەچەند پەڕەیەك تێپەڕ نەکات .

2- جوانکاری لە دەربڕیندا .

3- تەکنیك لە نوسیندا ، کەهەر نوسەرێك ڕێگایەکی تایبەتی خۆی هەیە بۆ ڕوونکردنەوە و داڕشتنی بابەتەکەی بەزمانی ڕووناکبیری سەرجەم .

4- بابەتی وتار ڕەنگدانەوەی بیر و هەست و سۆزی خودی خاوەنەکەیەتی .

جۆرەکانی وتار :

وتار وەك بەشەکانی تری ئەدەب بابەتی هەمەچەشنە لەخۆدەگرێت ، لەوانەش وتاری ( سیاسی ، ئاینی ، ڕەخنەیی ، مێژوویی ، کۆمەلایەتی ...)

## قۆناغەکانی ڕێڕەوی گەشەسەندنی وتار لەئەدەبی کوردی دا

### قۆناغی یەکەم / قۆناغی سالآنی 1939-1958

پ/ گەشەسەندن و لاوازبوونی بەرهەمی ئەدەبی کوردی پەیوەندی بە چییەوە هەیە ؟

و/ گەشەسەندن و لاوازبوونی بەرهەمی ئەدەبی کوردیمان پەیوەندی هەبووە بەو بارودۆخە سیاسی و کۆمەلآیەتی و ئابوورییەی ئەو دەمەی بەرهەمەکەی تێدا هاتۆتە ئاراوە .

پ/ گۆڤاری گەلاوێژ کەی دەرچووە ؟ چ ڕۆلێکی بەرچاوی بینیوە لە پێشخستنی بەشەکانی ئەدەب بەتایبەتی (وتار) ؟

و/ لەسالی 1939 دا گۆڤاری گەلاوێژ دەرچوو کە بەدرێژایی 10 سالٓ تا سالی 1949 بەردەوام بوو ، لەماوەی دەرچوونی ئەو گۆڤارەدا هەموو بەشەکانی ئەدەب و بەتایبەتی وتار گەشەسەندنێکی باشی بە خۆیەوە دیوە لە ڕوخسار و ناوەڕۆکدا .

پ/ چۆن ئەدەب بە گشتی بەدامەزراندنی کۆماری کوردستان لەسالی 1946 هەنگاوی بەرەو پێش ناوە؟

و/ تەوژمێکی تری وتار دەبینین بەهۆی دامەزراندنی کۆماری کوردستان لە مەهاباد لە سالی 1946 دا ، کەلەو ماوە کورتەی تەمەنی ئەو کۆمارەدا ئەدەب بەگشتی هەنگاوی بەرەوپێش ناوە و چەندان گۆڤار و ڕۆژنامەی هەمەچەشنە دەرچوون لەوانە :

(ڕۆژنامەی کوردستان 1946 ، هەلآلە 1946 ، گروگالی منداالآنی کورد 1946 ... )

پ/ لەسالآنی چل و پەنجاکاندا لە عێراق کۆمەلێ ڕۆژنامە و گۆڤار و بلاوکراوەوە کامانە بوون ؟ گرنگترین وتارنووسەکانیان کێ بوون ؟

و/ لەسالآنی چل و پەنجاکاندا لەعێراق پێش ڕوودانی شۆڕشی چواردەی تەمموزی 1958 چەندین ڕۆژنامە و گۆڤار هاتنە ئاراوە ، کە بەهۆیانەوە وتار هەنگاوی بەرچاوی ناوە ، لەوانە ( ڕووناهی 1941 ، نزار 1948 ، هیوا 1957 ) وەلە وتارنووسە دیارەکانی ئەو قۆناغە (برایم ئەحمەد ، حوزنی موکریانی ، عەبدولڕەحمانی زەبیحی ، جەلادەت بەدرخان ، عەلائەدین سوجادی ، ڕوقیەی قادری ، سولتانی خانمی فەتاحی قازی ... )

پ/ گرنگترین خاسیەتەکانی وتار لە قۆناغی (1939-1958) چۆن بوو ؟ بیانژمێرە

و/ 1- زمانی وتارەکان گەشەیان بەخۆیانەوە بینی چونکە زیاتر بەرەو کوردی پەتی دەبران ( هەرچەندە هەندێك جار دەقاودەق وشەی عەرەبی لە نوسیندا بەکارهێنراوە )

2- نیشانەکانی خالبەندی زیاتر بایەخی پێدراوە .

3- بەهۆی سەرهەلدانی وتار نووسی ژنەوە کە هاندانی ئافرەتی کورد بۆ خوێندن و خوێندەواری بابەتی سەرەکی ناوەڕۆکی وتارەکانیان بووە .

4- زۆر وتاری وەرگێڕدراو لە زمانەکانی دیکەوە دەکرانە کوردی و ناوەڕۆکی وتاری کوردییان پێ دەولەمەند دەکرا .

هەروەکو ﴿شەونمی بەری بەیان﴾ نموونەی وتارێکی ئەدەبییە کە لەگۆڤاری ﴿دەنگی گێتی تازە﴾ دا بە خامەی ﴿محەمەد ئەحمەد تەها – کامەران موکری﴾ لەساڵی 1946 دا بڵاوکراوەتەوە .

## قۆناغی دووەم –ساڵانی ﴿1958=1970﴾ ز

پ/ شۆڕشی 14ی تەمموز چ ڕۆڵێکی بینی لە بواری پێشخستن و گەشەسەندنی وتاری کوردیدا ؟ ئەو ڕۆژنامە و گۆڤارانە کامانەبوون کە لەو ماوەیەدا بڵاوکرانەوە .

و/ لە دوای شۆڕشی 14ی تەمموز چونکە ڕژێمێکی نوێ دامەزرا ، یاساکانی ڕژێمی پێشوو گۆڕان ، لەوانە بواری ڕادەربڕین و چاپەمەنی فراوانتر و ئازادتر بوو ، ئەمانە بوونەهۆی بەرەوپێشچوونی وتار لەم قۆناغەدا بەتایبەتی بەهۆی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی بڵاوکرانەوە وەك ﴿ شەفەق 1958 ، ڕای گەل 1959 ، بلێسە 1959 ، ڕۆژی نوێ 1960 ﴾

پ/ وتار لەسەرەتای شەستەکان و دوای شۆڕشی ئەیلوولی 1961 چۆن بوو ؟ لەم قۆناغەدا بەهۆی چیەوە وتار گەشەی سەند و ژیایەوە ؟ وتارنووسە ناودارەکانی ئەم ساڵانە کێ بوون ؟

و/ لەسەرەتای ساڵانی شەستدا بەهۆی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول و تێکچونی بارودۆخی سیاسی کوردستان ، بابەتی وتار بەرەو لاوازی و سستی ڕۆیشتووە ، بەڵام لە ناوەڕاستی شەستەکاندا و دواتر بەهۆی دەرچوونی چەند ڕۆژنامە و گۆڤارێك بوار بۆ گەشەسەندنی وتار ژیایەوە ، لەوانە ڕۆژنامەی ﴿برایی – برایەتی 1967 ،سلێمانی 1968﴾ وە لەنووسەر ناودارەکانی وتار لەم ساڵانەدا ﴿مارف بەرزنجی ، دزعیزەدین مستەفا ڕەسوڵ ، شێخ محەمەدی خاڵ ، گۆران ، ئەبو زەید مستەفا سندی ، ڕەمزی قەزاز ﴾

پ/ گرنگترین خاسیەتەکانی وتار لە قۆناغی ﴿1958=1970﴾ کامانەن ؟ بیانژمێرە

و/ 1= زمانی وتار پوخت تر بوو لەڕووی وشە و زاراوەوە دەوڵەمەندتر بوون ، بەتایبەتی کە زمانی نووسینی وتار بەدیالێکتی کرمانجی خواروو بوو موتوربە کراو بە وشە و زاراوەی دیالێکتەکانی دیکە .

2= هەوڵ دراوە ڕێنووسێکی ڕاست و دروست پەیڕەو بکرێت و شێوازە هونەریەکەشی بەرز و پڕ لەجوانکاری بێت .

3= لە ڕووی ناوەڕۆکەوە بابەتی سیاسی بۆ خۆی سەرەکیترین بابەتی وتار بووە ، کەباسی بیری ئازادیخوازی و پێشکەوتن خوازی کراوە ، زیاتریش جەخت لەسەر بیروباوەڕی نەتەوەیی و مافەکانی کورد و یەکگرتنەوەی کوردستان کراوە .

4= لەپاڵ گەشەسەندنی وتاری سیاسی وتاری کۆمەڵایەتی و مێژوویی ئاسۆی فراوانتریان لەبەردەم کرایەوە بەتایبەتی باسی ئەو بابەتانەکراوە کە پەیوەندییان بەنەتەوەی کوردەوە هەبووە .

5= لەم قۆناغەدا زۆر وتار لەزمانەکانی بێگانەوە وەرگێڕدراون بۆ سەر زمانی کوردی لەهەموو بوارەکانی ئەدەبی ڕووناکبیری .نمونە بۆ وتاری ئەم قۆناغە ئەو وتارەیە کە بەخامەی ﴿ڕەمزی قەزاز ﴾ نووسراوە لە ساڵی 1967 دا و لە ژمارە 29 ی ڕۆژنامەی ﴿برایی﴾ بڵاوکراوەتەوە.

## قۆناغی سێیەم (1970 – 1991)

پ/ دەرچووانی بەیانی (11)ی ئازاری 1970 چ ڕۆڵێکی بینی لەبەرەوپێشچوونی وتاری کوردی ؟

و/ 1– گەلێك یانە و کۆمەڵە دەرکەوتن کە هەریەکەیان بۆ گەیاندنی بیری خۆیان چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیان دەرکرد کە ئەمە خۆی لە خۆیدا هەنگاوێکی تر وتاری بەرەو پێش برد .

2– ئەم بارودۆخە بووە هۆی ئەوەی کە بزوتنەوەیەکی ڕۆشنبیری و هۆشیاری لەناو نووسەران و جەماوەردا خولقاند .

3–گەلێك ڕۆژنامە و گۆڤاری ئەدەبی و زانستی و ڕووناکبیری هاتە مەیدانەوە لەوانە (زانیاری 1970 ، نووسەری کورد 1971 ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد 1973 ، گۆڤاری ڕۆژی کوردستان 1971 )

پ/ چۆن نووسەرانی کورد لە شارەکاندا توانیویانە وتار بەرەو پێش بەرن لە قۆناغی 1970–1991 دا ؟

و/ نووسەرانی کورد لەشارەکاندا لەوچەند ژمارە کەمەی ئەو گۆڤار و ڕۆژنامانەی کەدەرچوون توانیان وتار بەرەو پێش بەرن ، وەك ( هاوکاری ، بەیان ، ڕۆشنبیری نوێ )

پ/ چۆن نوسەرانی شاخ بایەخیان بە وتار داوە ؟ چ جۆرە وتارێك ؟ وەکو کام بلاوکراوانە ؟ دەنگە دیار و قەڵەم ڕەوانەکانی وتار لەشاخ کێن ؟

و/ لەپاڵ نووسەرانی شاردا نووسەرانی شاخیش لە بلاوکراوەکانی ناو شۆڕشدا چالاکانە بایەخیان بە وتار داوە بەتایبەتی وتاری سیاسی لە بلاوکراوەکانی شاخ وەك : ( نووسەری کوردستان 1981 ، گزنگ 1982 ، هەڵمەت 1985 ، قەندیل 1987 ، هەڵوێستی ئەدەب 1988 ، بانگ 1989 ) لەنووسەرە دیارەکانیشیان وەك (تەها بەرواری ، مستەفا نەریمان ، عەبدول ڕەحمان مزوری ، جەمال خەنەدار ، عەلی سەیدۆ گەورانی ، سەلاح شوان ... )

پ/ لەدوای سالانی 1980 بەدواوە نووسەران بەرگرییان لە چی دەکرد ؟

و/ نووسەرانی کورد لە ڕێگای بەرهەمە ئەدەبییەکانەوە بەرگرییان لە سیاسەتی توانەوەی نەتەوەکەیان دەکرد ، هەربۆیە وتارەکانی ئەو سالانە بۆ خۆیان دەبوونە بنەما و پێك هێنەرێکی پتەوی ئەدەبی کوردی .

پ/ گرنگترین خاسیەتەکانی وتار لە قۆناغی (1970–1991) چییە ؟ بیانژمێرە

و/ 1– لەسەرەتای سالانی حەفتاکاندا زمانی وتار گەشەیەکی زۆر دیاری بەخۆیەوە دی کە لە قۆناغەکانی پێشووتر بەو ڕادەیە نەبینراوە ، بەتایبەتی کە بەرنامەی خوێندن لە قۆناغەکانی ناوەندی و ئامادەیی بوون بە کوردی ، ئەمەش وای کرد کە کۆمەڵێك وشە و زاراوەی نوێ بێتە ناو فەرهەنگی زمانی کوردییەوە و دەوڵەمەندتری بکات .

2– لە دوای نسکۆی شۆڕشی ئەیلول لە سالی 1975دیاردەیەك کە بەئاشکرا هەستی پێدەکرێت بەتایبەتی لەبلاوکراوەکانی ناو شاردا

بریتی بوو لەدەربڕینی ناڕاستەوخۆ واتە پەنابردنەبەر بەكارهێنانی هێما و نیشانە ، ئەمە لەكاتێكدا لەسەرەتای حەفتاكاندا نووسەران بێ ترس و سڵكردنەوە هەست و سۆز و بیری خۆیان دەردەبڕی چونكە بارودۆخەكە ئازادی و سەربەستی بۆ نووسەران دروست كردبوو.

3- لەم قۆناغەدا وتار وەك هۆیەك بۆ پاراستنی زمانی كوردی بەكاردەهێنرا ، چونكە ڕژێمی دوژمن بەنەتەوەی كورد ، هەولی شێواندن و لەناوبردنی زمانی كوردی دەدا .

4- لە دوای نسكۆی 1975 جیاوازی كەوتە نێوان نووسەرانی شار و شاخ لەخستنەڕووی بابەتەكاندا چونكە ئەو سەربەستیەی نووسەرانی شاخ هەیانبوو هەرگیز نووسەرانی شار نەیانبوو ، لەبەرئەوە وتاری سیاسی لە ڕۆژنامە و گۆڤارەكانی ناو شاردا پاشەكشەی كرد بەرامبەر ئەوە لە بڵاوكراوەكانی شاخ واتە ناو شۆڕش بایەخی زۆری پێدەدراو زیاتر گەشەی دەكرد لەبەرئەوە نووسەرانی شار هەولیان دەدا لە ڕێگەی وتارە كۆمەلایەتی و مێژوویی و ڕۆشنبیرییە گشتیەكاندا بیرو بۆچوون و هەست و سۆزی نەتەوایەتیان پیشان بدەن ، وەك لەو دەقەی (سەبری بۆتانی) كەلەساڵی ( 1983) دا بڵاوكراوەتەوە .

## چیرۆكی كوردی لەجەنگی دووەمی جیهانییەوە

قۆناغەكانی گەشەكردنی چیرۆكی هونەری كوردی ئەمانەن :

قۆناغی یەكەم / چیرۆكی هونەری كوردی لەساڵی 1939 -1958 ز :

پ/ بۆچی قۆناغی (1939-1958) بە قۆناغی گەشەسەندنی چیرۆكی هونەری كوردی دادەنرێت ؟

و/ چونكە لەم قۆناغەدا هونەری نوسینی چیرۆكی كورت نەش و نمای كرد كە لێرەدا دەرچوونی چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەك ڕۆڵێكی بەرچاویان هەبوو لەگەشەسەندنی وەكو گۆڤارەكانی (گەلاوێژ ، دەنگی گێتی تازە) لە بەغدا ، (هاوار ، ڕۆژانو) لەشام ، (شەفەق) لەكەركوك ، ڕۆژنامەی (ژین ، ژیان) لە سلێمانی

## چیرۆكی كوردی لە گۆڤاری گەلاوێژ (1939-1949) ز

پ/ ڕۆڵی گۆڤاری گەلاوێژ چی بوو لە پێشخستنی چیرۆكی هونەری كوردی؟

و/ گۆڤاری گەلاوێژ ڕۆڵێكی دیار و ئاشكرای لە جێگیربوون و ڕەگ داكوتانی چیرۆكی هونەری كوردیدا هەبووە و هەرلەیەكەم ژمارەیەوە گۆشەیەكە تایبەتی بۆ چیرۆك داناوە ، ناوی نابوو (چیرۆكی ئەم مانگە) كەلەسەرجەم ژمارەكانی ئەم گۆشەیەدا دەبینرێت تا دوا ژمارەی كە ژمارە(116) یە چونكە بە بەشێكی سەرەكی ئەدەبی نوێیان زانیوە .

پ/ چیرۆکە وەرگێڕدراوەکانی گۆڤاری گەلاوێژ چ رۆڵێکیان هەبووە بۆ گەشەسەندنی چیرۆکی کوردی ؟ چیرۆکە وەرگێڕدراوەکان هی کێ بوون ؟

و/ئاوەڕدانەوە لە چیرۆکە وەرگێڕدراو کارێکی زۆربەجێ بووە بۆ چاوکردنەوەی لاوەکانی ئەوساش بەکەڵك بووە ، بەتایبەتی ئەو چیرۆکە وەرگێڕدراوەکان هی ئەو نووسەرانە بوون کە ناوبانگیان لە جیهاندا هەبووە ، سەرنجی نووسەر و خوێنەرانی کوردیان ڕادەکێشا بۆ ئەم ناوانە (بەلزاك ، مەکسیم گۆرکی ، چیخۆف ، مۆپاسان ، ئەندرسن ، تۆلستۆی ،جبران خلیل جبران ، تۆفیق حەکیم ) چیرۆکەکان زیاتر لە زمانی ئینگلیزی و هەندێکیان لە زامنی عەرەبیەوە وەردەگێردران .

پ/بابەتی دیاریناوەڕۆکی ئەو چیرۆکانەی کەلە گۆڤاری گەلاوێژدا بلاودەکرانەوە چییە ؟ لە پای ئەم بابەتەدا چ بابەتێکی تر دەبینرێت ؟

و/ بابەتی دیار : ناکۆکی و ململانێی نێوان دوو چینی سەرەکی کۆمەڵ بوون دەرەبەگ و ئاغاکان لەلایەك جوتیار و ڕەش و ڕووتی کوردستان لەلایەکی ترەوە ، کەوێنەی ژیانی پڕمەینەتی ئەو ڕۆژانەی شەڕی دووەمی جیهانی بوون ، هەر لەپای ئەو بابەتەدا ئەمانە دەبینرێن : 1- ڕەخنەگرتن لە نەریت و خووڕەوشتی دواکەوتووی کۆمەلایەتی .

2- لە چیرۆکەکانی گەلاوێژ نووسەرەکان بەتەواوەتی لایەنگیری جوتیارن .

3- لەبەشێك لە چیرۆکەکانی گەلاوێژ (ئافرەت) کراوە بە پاڵەوانی چیرۆك .

4- باسی هەندێك لە دەردەکانی چەوسانەوەی ئافرەت کراوە وەك شیربایی ، کچ فرۆشتن .

مەبەستی نووسەرەکانیان ڕەخنەگرتن بووە لە دواکەوتوویی کۆمەڵگە و لەوانەی دەبنە هۆی ئەم دواکەوتنە .

پ/ بایەخدانی چیرۆك نووسانی کورد بەو کێشە و دیاردە کۆمەلایەتیانە بووە هۆی چی ؟

و/ بووە هۆی ئەوەی کە ڕاستەوخۆ چیرۆکی کوردی بەرەو ڕێبازی ڕیالیزمی هەنگاوبنێت ، دیارترین چیرۆك نووسەکانی گۆڤاری گەلاوێژ ئەمانە بوون ( شاکر فەتاح ، عەلائەدین سوجادی ، برایم ئەحمەد)

## تەکنیك و زمانی داڕشتنی چیرۆکەکان

پ/ تەکنیك و زمانی داڕشتنی چیرۆکەکان لەسەرەتای گۆڤاریگەلاوێژدا چۆن بوون؟

و/ 1- لە ڕووی زمان و تەکنیکەوە پێشکەوتنی ئەوتۆیان پێوە دیار نیە .

2- زمانی نووسینی چیرۆکەکان گێڕانەوەی ئاساییە و هیچ کاریگەرییەکی هونەری نوێی چیرۆکنووسی پێوە دیار نیە و هەوڵیان داوە باسێکی فۆلکلۆری یان ئەفسانەیی بێنن بەرگی چیرۆکێکی هونەری بەبەردا بکەن .

پ/ تەکنیك و زمانی دارشتنی چیرۆکەکان لەسەردەمێکی دواتری گۆڤاری گەلاوێژ چۆنبوون ؟

و/ 1- زمانی چیرۆکەکان بەرەو کوردی پەتی سفت و ڕەوان دەڕوات و پاك دەبێتەوە لەوشەی بێگانە و لە جێگایان وشەی کوردی ڕەسەن یان وشەی گونجاو بەکارهێنراوە .

2- لەڕووی تەکنیکی هونەرییەوە لە چاو پلەی پێش خۆیان بەرەو پێش چوون سیمای هونەری نوێیان پێوە دیارە .

3- رستە و وەسفەکان بەسۆز و کاریگەرن .

4- زنجیرەی باسەکان هەر لەسەرەتاوە تا ئەنجام باش بەیەکەوە بەندن و خوێنەر ڕادەکێشن بۆچێژ لێوەرگتنیان .

## چیرۆکی کوردی لەگۆڤاری هاوار (1941-19439)

پ/ گۆڤاری هاوار لە کوێ دەرچوو ؟ بایەخی بەچی داوە ؟ بۆچی ؟

و/ گۆڤاری (هاوار) لەسالانی (1941)تا(1943) لەشام دەردەچوو ، بایەخی زۆری بەبلاوکردنەوەی چیرۆك داوە ، چونکە لە نرخ و بەهای ئەم هونەرە تازەیە باش تێگەیشتووی.

پ/ چیرۆکەکانی گۆڤاری هاوار بە چی شێوەزارێك نووسراون ؟ دیارترین چیرۆك نووسە بەتوان و بەهرەمەندەکانیان کێن ؟ بۆچی هەندێك لە چیرۆکەکان بە چیروکی هونەری دادەنرێن ؟

و/ چیرۆکەکانی گۆڤاری هاوار بەشێوەزاری کرمانجی ژوورو بەشی بۆتانی نووسراون و دیارترین چیرۆك نووسەکانی بریتین لە (جەلادەت بەدرخان ، کامەران بەدرخان ، قەدری جان ، ئوسمان سەبری ، نورەدین زازا ... ) بوون . وە (1) هەندێك لە چیرۆکەکانیان بە چیرۆکی هونەری دادەنرێن چونکە پلەی هونەرییان بەرزە ، (2) هەندێکی تریان سیمای حەکایەتی فۆلکلۆری کوردییان پێوە دیارە ، (3) هەندێکی تریشیان لەسەر زمانی گیانداران نوسراون .

پ/ ناوەڕۆکی چیرۆکەکانی گۆڤاری هاوار چۆن بوون ؟

و/ 1- زیاتر هەوڵیان داوە مەسەلەی نەتەوایەتی و خەباتی چینایەتی بخەنە ڕوو .

2- ڕەخنە لە ناهەمواری کۆمەڵگا دەگرن .

3- دەردی هەژاری و نەخوێندەواری دەخەنە ڕوو .

پ/ چیرۆکی وەرگێراو لە چیرۆکەکانی گۆڤاری هاواردا چۆن بوو ؟

و/ ئەم گۆڤارە بایەخی داوە بە چیرۆکی وەرگێردراو بە تایبەتی کە لەزمانی فەرەنسی و عەرەبیەوە دەکرانە کوردی ، هەندێك جاریش هەر چیرۆکە کوردییەکان لە هەمان ژمارەدا کراون بە فەرەنسی کەئەمەش ئەزمونێکی تازەبوو لەئەدەبی کوردیدا.

پ/ لەرووی تەکنیکەوە چیرۆکەکانی گۆڤاری هاوار چۆن بوون ؟

و/ لەرووی تەکنیکەوە بەشی هەرەزۆری چیرۆکە نووسراو و بلاوکراوەکان لە ئاستێکی هونەری پێشکەوتوودان و تەواو و تۆکمەن چونکە چیرۆکنووسەکان زمانی فەرەنسی و ئەلمانی و ئینگلیزییان زانیوە .

## چیرۆکی کوردی لە گۆڤاری شەفەقدا (1958)

پ/ رۆلی گۆڤاری شەفەق چی بوو لە پێشخستنی چیرۆکی هونەری کوردیدا ؟

و/ گۆڤاری شەفەق لەسەرەتای سالی (1958) لەشاری کەرکوك دەرچوو رۆلێکی بەرچاوی هەبوو لە پێشخستنی هونەری کوردیدا بۆ ئەم مەبەستەش گرەوێکی رێکخست بۆ باشترین سێ چیرۆکی کوردی لەئەنجامدا چیرۆکی (چای شیرین) ی حسێن عارف پاداشتی یەکەمی وەرگرت کە بە ناوی خوستراوی (محمد صدیق عارف) بلاوکرایەوە ،چیرۆکی (چەندم لێ ئەستێنی)ی مستەفا صالەح کەریم پاداشتی دووەمی پێدرا ، وە چیرۆکی (شەوێکی درێژ) ی محمد صالح دیلان پاداشتی سێیەمی پێدرا .

پ/ ئەو چیرۆکنووسانە کێ بوون کە لەماوەی نێوان(1939-1958) دا چیرۆکی کورتیان نووسی ؟

و/ _حسێن عارف ، محەمەد مەولود (مەم) ، شێخ مارف بەرزنجی ، جەمال بابان ، محەرەممحەمەدئەمین ، کاکە مەم بۆتانی ، حەسەن قزلجی ....

پ / چیرۆکی مام ناوەند چی یە؟ بۆ یەکەم جار لەلایەن کێوە بلاوکرانەوە و جێگریان کرد؟

و/ چیرۆکی مامناوەند : ئەو چیرۆکەیە کە ماوەی رووداوەکانی و ژمارەی کەسەکانی زیاترە لە چیرۆکی کورت بەلام ناگەنە چیرۆکی درێژ . وە بۆیەکەم جار لە گۆڤاری شەفەقدا چەند چیرۆکنوسێك چیرۆکی مام ناوەند جێگیردەکەن، لەوانە :

1- (جەمال بابان) بە چیرۆکی (خانزاد) و (پەلە هەورێکی چلکن).

2- (جەمال نەبەز) بە چیرۆکی (لالۆ کەریم).

3- (محەمەد سالەح سەعید) بە چیرۆکی (کاروانی).

پ/ ئەو چیرۆکە مامناوەندییانە کامانەن کە لەکاتی خۆیدا چیرۆکی مامناوەندییان پێ جێگیر نەبوو؟خاوەنەکانیان کێن ؟ کەی نوسراون و کەی بلاوکراونەتەوە ؟

و/ 1- چیرۆکی (لەخەوما) ی (جەمیل سائیب) کەلەسالی (1925) دا نووسراوە ، بەلام لەسالی (1975) داچاپکراوە .

2- چیرۆکە (مەسەلەی ویژدان) ی (ئەحمەد موختار جاف)کە لەسالی 1929 دا نوسراوە ، بەلام لە سالی 1970 چاپکراوە ۔

ئەم چیرۆکانە لەبەرئەوەی کە لەکاتی خۆیدا بە کتێب بلاونەکراوەتەوە بۆیە نەیانتوانیوە چیرۆکی مامناوەند جێگیر بکەن ۔

## قۆناغی دووەم / چیرۆکی هونەری کوردی لە سالی (1958- 1970)ز

پ/ لە قۆناغی دووەمدا(1958-1970) جۆرە سستی و لاوازییەك لە بواری چیرۆکی هونەری کوردیدا دەبینرێت بۆچی؟

و/ 1- بەهۆی ئالۆزبوونی باری سیاسەت ولات ۔

2- بەرپابوونی شۆڕشی نەتەوەیی ئەیلول لەسالی(1961) دا دژی ڕژێمی قاسم۔

3- بە ئاشکرا بەربەرەکانی چاپەمەنی کوردی دەکرا۔

پ/ بۆچی لە ناوەڕاستی سالانی شەستدا چیرۆکی کوردی تارادەیەك پشووی پیا هاتەوە؟

و/ چونکە چەند گۆڤار و ڕۆژنامەیەکیش دەرچوون و زەمینەیەکی لەباری بۆ ڕەخسا کە جارێکی تر پێش بکەوێتەوە ، هەندێك لە چیرۆك نووسەکانی ئەم قۆناغە ( مارف خەزنەدار،جەمال بابان، کاکە مەم بۆتانی ، دکتۆر کاوس قەفتان ، ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل و هەندێکی تریش ) ۔

پ/ چیرۆکی هونەری کوردی لە قۆناغی (1958-1970) دوو جۆری سەرەکی بوون کامانەن ؟

و/ 1- هەندێکیان زۆر سادەن و بابەتەکانیان دوور لە ڕوخساری هونەری خراونەتە بەرچاو ، لە جوغزێکی نائومێدی دەخولانەوە و پێشکەوتنیان بەدەست نەهێناوە ۔

2- بەشێکی تریشیان گەشەو پێشکەوتنیان پێوە دیارە ، چ لە ڕووی ناوەڕۆك و ڕوالەتی هونەری و ڕەوانی زمانەوە بێت چ لەڕووی ئەوەی کە مۆرکی کوردەوارییان پێوەدیاربێت ، قارەمانەکانیان کەسانی ناو کۆمەلی کوردەواری بوون ، ڕووداوەکانیش ڕووداوەکانیش ڕووداوی سەردەمەکە بوون چیرۆکی کوردی لەڕووی ناوەڕۆکەوە بایەخی بە کێشەی سیاسی و کۆمەلایەتی چینایەتی سەردەمەکە داوە ۔

پ/ بۆچی لەم قۆناغە (1958-1970) بەدواوە چیرۆکنووسان هەولیان داوە زۆر بەئاشکرا باسی بابەتە سیاسیەکان بکەن ؟

و/ 1- لەبەرئەوەی چیرۆکنووسان زۆربەیان لەگەلْ شۆڕشی کورد و سەر بە بزوتنەوەی نیشتمانی بوون چ بە بیروباوەڕ بێت یان بەکردار ۔

2- ڕۆژانەش بەچاوی خۆیان چەوساندنەوە و ڕاوەڕووت و زولم و ئەشکەنجەدانی گەلەکەیان دەبینی بەدەستی ڕژێمی داگیرکەری کوردستان ۔

3- ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە نرخی هونەری چیرۆکەکان بێتە خوارەوە لە داهێنان بکەوێت ، زمانی چیرۆکەکان سادە بن،

شێوە و تەکنیکیان لاواز بێت .

4- بارودۆخە سیاسیەکانیش کاری کردۆتە سەر چیرۆك نووسەکان کە لە ڕووی داڕشتندا چیرۆکەکانی بەرەو چڕکردنەوە بەرن تاڕادەیەکیش ڕەمزیان بەکارهێناوە .

## قۆناغی سێیەم / چیرۆکی هونەری کوردی لە سالی ( 1970-1991) ز

پ/ بۆچی سالی (1970) بە قۆناغێکی نوێ دادەنرێت لە مێژووی گەلی عێراق بە گشتی گەلی کورد بەتایبەتی ؟

و/ چونکە بۆ یەکەمین جار حکومەتی عێراقی دانی نا بە مافە ڕەواکانی گەلی کورددا .

پ/ کاریگەری ڕێکەوتننامەی 11ی ئازاری 1970 چی بوو لەسەر باری ڕۆشنبیری و ئەدەبی لای گەلی کورد ؟

و/ 1- زەمینەیەکی لەبار و ڕێگە خۆشکەر بوو بۆئەوەی چەندین دەزگای ڕۆشنبیری کوردی بێتە کایەوە .

2- کۆمەڵێك ڕۆژنامە و گۆڤاری جۆراوجۆر بە زمانی کوردی دەردەچوون وەکو ڕۆژنامەکانی ( هاوکاری ، برایەتی ، بیری نوێ ،ژین) هەروەها گۆڤاری ( بەیان ، ڕۆژی کوردستان ، ڕۆشنبیری نوێ ) کە ئەم گۆڤار و ڕۆژنامانە زەمینەیان بۆ بلاوکردنەوەی کۆمەڵێك چیرۆك ڕەخساند .

3- چاپکردنی چەندین کۆمەڵە چیرۆك کە دواتر بوون بەهۆی گەشەسەندنی زیاتری چیرۆکی کوردی .

4- دەرچوونی بەیانی (ڕوانگە) لەبەهاری سالی 1970

پ/ کاریگەری سەرهەڵدانی گروپی ڕوانگە چی بوو لەسەر چیرۆکی کوردی لە سالی 1970 دا ؟

و/ 1- ژمارەیەك چیرۆکنووسی نوێی پێگەیاند.

2- سازدانی کۆڕی ئەدەبی و زالبوونی کەش و هەوایەکی باش بۆ گفتۆکردن لەسەر باری ڕۆشنبیری گشتی .

3- ڕوانگە چیرۆکی کوردی لە سستی و جوینەوە ڕزگارکرد و قەوانە کۆنەکانی لە ئەدەب ورد و خاش کرد، زەمینەیەکی نوێی بۆ چیرۆکی کوردی ئامادەکرد .

4- دیوارێکی لە نێوان چیرۆکی کۆن و نوێدا دروست کرد .

5- بە تەکنیکی تازەو بەکارهێنانی دیالۆگ و مەنەلۆگ و چڕکردنەوەی گێڕانەوە و بەکارهێنانی تەوژمی هۆش ئاستی چیرۆکی کوردی بەرزکردەوە .

پ/ ئەو کۆمەڵە چیرۆك نووسانەی قۆناغەکانی پێشوو کامانەن کە بە بۆچونی تازە و کەرەستەی تازەوە بەردەوام بوون ؟

و/ (حسێن عارف ، محەمەد مەولود مەم، کاکە مەم بۆتانی ، مستەفا سالح کەریم ).

پ/ ئەو چەند چیرۆك نووسە تازانە کامانەن کە بۆیەکەمین جار دەستیان بە نوسینی چیرۆك کرد ؟

و/ (محەمەد موکری ، محەمەد فەریق حەسەن ، ئەحمەد محەمەد ئیسماعیل ، ڕەئوف بێگەرد ، ئەنوەر محەمەد تاهیر ، دکتۆر نافع ئاکرەیی ، شەعبان مزوری ، شیرزاد حەسەن )

پ/ لە قۆناغی سالانی (1975-1991) چەند ڕووداوی گرنگ کاریگەرییان هەبووە بەسەر ڕەوتی چیرۆکی کوردیدا چین ؟

و/ 1- شکستی شۆڕشی مەزنی ئەیلول بوو لە ناوەڕاستی سالانی حەفتادا بە پیلانی دو ژمنانی کورد .

2- هەلگیرسانی شەڕی (1980-1988) واتە شەڕی درێژخایەنی هەشت سالەی نێوان عێراق و ئێران .

پ/ لە سالی (1970) بەدواوە بابەتەکانی چیرۆکی کوردی چۆن بوون ؟پاشان چی بوو بە هەوێنی چیرۆك ؟

و/ لە سالی (1970) بەدواوە بابەتەکانی چیرۆکی کوردی گۆڕان هەرچەندە هەندێك لەو بابەتانەی پێشوو دووبارە دەبنەوە ، بەلام لەپالْ کێشەی کرێکار و خاوەنکاری دەولەمەند ، گیروگرفتی شاریش بووە هەوێنی چیرۆك .

پ/ لەدوای سالی (1975) جۆرە چیرۆکێك پەیدا بوو کە دەتوانین ناوی بنێین چیرۆکی بەرگری لە مافە ڕەواکانی گەلی کورد بۆچی ؟ پاشان چیرۆکنووسەکان چ ئەرکێکی پیرۆزیان کەوتە سەرشان ؟ وەکو کێ ؟

و/ 1- چونکە پاش شکستی (1975) بوون و مانەوەی کورد کەوتە مەترسیەوە .

2- تاوانی لەناوچوون و جینۆساید بە ئاشکرا بەرامبەر کورد پەیڕەو دەکرا .

3- کورد کەوتە بەرامبەر هێزێکی دڕندەی وەك بەعس کە خاوەن تازەترین چەك بوو ، بۆیە چیرۆك نووسەکان ئەرکێکی پیرۆزیان کەوتە سەرشان کە ئەویش :

1- داکۆکی کردن بوو لە نەتەوەی خۆیان .

2- هاندانی خەلك بۆ بەرگریکردن .

3- هۆشیارکردنەوەی کورد لە ڕووی بیروباوەڕەوە .

وەکو چیرۆکەکانی ( کاکە مەم بۆتانی ، محەمەد موکری ، محەمەد فەریق حەسەن ، ڕەئوف بێگەرد ، ڕەئوف حەسەن )شاهیدی ئەمانەن .

پ/ چیرۆکە کوردی لە قۆناغی (1970-1991) چۆن سوودی لە بەیت و لاوك و داستانی کۆنی فۆلکلۆری وەرگرتووە؟

و/ کەئەمەش ئاوەڕدانەوەیەکی پیرۆز و سەرەتایەکی لەباربوو بۆ چیرۆك نووسەکانمان کە ئاوڕ لە گەنجینەی (بەیت و لاوکی) کوردی بدەنەوە و بەکاریان بێنن بۆ خستنەڕوو و بەرجەستەکردنی هیوا و خەمەکانی م-رۆڤی کوردی هاوچەرخ وە لە چیرۆکی (لاوکی سوارە) ی محەمەد فەریق حەسەن و (بەیتی سمۆ)ی ڕەئووف بێگەرد و (هێلەگ) ی عەبدوللا سەڕاج .

پ/ ڕەمز(جەفەنگ)چییە؟ لە بارودۆخێکدا بەکاردێت ؟ ئەو ڕەمزانە کامانەن کە لە چیرۆکدا بەکارهاتوون ؟

و/ ڕەمز : شێوەیەکە لە شێوەکانی تەکنیك بۆ جوانکاری بەکاردێت هەروەها بۆ داپۆشین و شاردنەوەی ئەسڵی مەبەستی چیرۆك نووس ، ڕەمز لەو بارو دۆخانەدا بەکاردێت کە ڕێگەی دەربڕینی ڕاستەوخۆ لە نووسەران دەگیرێت بەهۆی بارودۆخی سیاسی و توندوتیژی داگیرکەران ، بۆ نمونە (ڕەوە بەراز) ڕەمزی داگیرکەرە یان شەرخوازی یە ، (داربەڕوو) ڕەمزی کوردو ڕەگ داکوتانی کوردە لەناو خاکی کوردستان ، (ئەسپ) زۆرجار ڕەمزی شۆڕشە .

پ/ چۆن چیرۆکی کوردی لەقۆناغی (1970-1991) سوودی لە هونەری سینەما وەرگرتووە ؟ وەکو چیرۆکەکانی کێ ؟

و/ چیرۆکی کوردی لەم قۆناغەدا سوودی لە هونەری سینەما وەرگرتووە و کەئەمەش چەکێکی تازەی دایە دەست نووسەر ، بووەهۆی شکاندنی قالبی خۆبەستنەوەی چیرۆك نووس لە کاتێکی دیاریکراودا ، کەئەمەش لە چیرۆکەکانی (حسێن عارف ، شێرزاد حەسەن ، محەمەد موکری ، ئەحلام مەنسوور ، ئەنوەر محەمەد تاهیر ، عەبدوللا سەڕاج ) دەبینرێت .

پ/ بۆچی کاریگەری ئەدەبی بێگانە بە ئاشکرا بەسەر چیرۆکەکانی قۆناغی (1979-1991) دا دیارە ؟ پاشان سودیان لە چیرۆکی کێ بینیوە ؟ بۆچی ؟

و/ کاریگەری ئەدەبی بێگانە واتە چیرۆکی گەلانی تر زۆر بە ئاشکرا دیارە بەسەر چیرۆکەکانی ئەم قۆناغەدا بەتایبەتی (ئەمریکای لاتینی و ئەڵمانی و ڕووسی) بەشێوەیەکی ئاشکرا لە نیوەی دووەمی سالانی حەفتا و هەشتاکاندا ،کە ئەمەش شتێکی ئاساییە چونکە دەکرێت سوود لە ئەزمونی گەلانی تر وەربگیرێت بۆ دەولەمەندکردن و بەرەوپێش بردنی ئەزموی چیرۆکی خۆمان.

پ/ زمانی چیرۆك لای چیرۆکنووسانی قۆناغی (1970-1991) چۆن بووە ؟ بە نمونە ڕوونی بکەرەوە

و/ لەڕووی زمانەوە ناکرێت بڵێین کە زمان لای هەموو چیرۆکنووسەکانی ئەم قۆناغە وەك یەك یان بەیەك ئاست ناوبنرێت بگرە لای هەندێك چیرۆکنووس زۆر سادە و ساکارە و درێژەپێدەری زمانی نوسینی چیرۆکە لە قۆناغەکانی پێشووتر لەگەڵ گۆڕانکارییەکی کەم بەلام لای هەندێ چیرۆکنووسی تر زمانی نوسینی چیرۆکەکان جیاوازتر و چڕوپڕتر و تۆکمەتر بوو بۆ نمونە چیرۆك نووس (شێرزاد حەسەن) بە ئاشکرا خاوەن زمانێکی دەولەمەندی تایبەت بە خۆیەتی ، زمانی شیعر زاڵە بەسەر زمانی چیرۆکەکانی دا کە خوێنەر ڕادەکێشێت و وای لێدەکات چێژ لە خوێندنەوەی چیرۆکەکانی وەربگرن ، ئەمەش بە ئاشکرا لە هەردوو کۆمەڵە چیرۆکەکانی (تەنیایی) و (گوڵی ڕەش) دیارە ، کەیەکەمیان لە سالی (1983) ز دووەمیشیان لەساڵی (1989) بلاوکراونەتەوە .

پ/ زمان لە چیرۆکەکانی (حسێن عارف) دا چۆن بووە ؟ لەکام چیرۆکانەیدا ؟ سالی چەنج بلاوکرانەوە ؟

و/ زمان لای (حسێن عارف) زمانێکی کوردی تۆکمە و بە پێزە بە تایبەتی لە کۆمەلە چیرۆکەکانی (تویشووی سەفەرێکی سەخت) و (گەلەگورگ) کە یەکەمیان لە سالی (1987) دا بلاوکرایەوە و دووەمیان لە سالی (1983) بلاوکراوەتەوە بە تایبەت لە کۆمەلە چیرۆکی (گەلەگورگ) زمان زۆر دەولەمەندتر و شیرینتر و سەرنج ڕاکێشترە لە چاو هەموو چیرۆکەکانی پێشووی .

## ڕۆمان لە ئەدەبی کوردیدا

پ/ ڕۆمان چی یە؟ لە کەیەوە سەری هەلداوە ؟ بەچی ناوبراوە ؟ دیارترین ڕۆمان نووسەکانی جیهان کێن ؟

و/ ڕۆمان : واتە چیرۆکی درێژ کە ڕووداوەکانی زۆر چڕ و پڕن ، ماوەی ڕووداو و ژمارەی کەسەکانی زیاترن لە چیرۆکی کورت و مامناوەند .

ڕۆمان نوسین یەکێکە لە هونەرە ئەدەبیە گرانەکان ، لەسەدەی حەڤدەهەمەوە لە ئەوروپا سەری هەلداوە بەلام چەرخی زێرینی ڕۆمان لە ئەوروپا سەدەی نۆزدەهەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمە ، زۆر لە ڕەخنەگران بە داستانی سەدەی تازە ناوی دەبەن ،دیارترین ڕۆمان نووسەکانی جیهان ئەمانەن : (تۆلستۆی ، هەمنگوای ،بەلزاك ، دیستۆفیسکی ، گۆرکی ... ) .

پ/ بۆچی نووسینی ڕۆمان لەناو کورددا دواکەوتووترە لە چاو نەتەوەکانی فارس و تورك و عەرەب؟ باسی بکە

و/ چونکە ئەو بارودۆخەی کە بۆ نوسەرێکی عەرەب و فارس و تورك هەلکەوتووە هەرگیز بۆ نوسەرێکی کورد هەلنەکەوتووە ، بگرە زۆرجاریش نووسەری کورد دژایەتی کراوە و دەرفەتی چاپکردنیشی زۆر دژوار و ئەستەم بووە .

## سەرەتای ڕۆمان نووسین لە ئەدەبی کوردیدا

پ/ بۆ یەکەمین جار نوسینی ڕۆمان بەزمانی کوردی لەکوێ سەری هەلدا ؟ کێ ڕابەری بوو ؟بەرهەمەکانی دیاری بکە

و/ بۆ یەکەمین جار نوسینی ڕۆمان بە زمانی کوردی لە ناو کوردەکانی یەکێتی سۆڤیەتی پێشوو دەستی پێکردووە ، یەکەمین هەولیش لە لایەن نوسەری گەورە (عەرەبی شەمۆ) دراوە کەلە سالی 1935ز ڕۆمانی (شڤانی کورد) بە دیالێکتی کرمانجی ژوورو و بە پیتی لاتینی نوسیوەتەوە وە دواتر ئەم ڕۆمانە تەرجومەکراوە بۆ زمانەکانی (ڕووسی و فەرەنسی و ئەرمەنی ) پاشان ڕۆمانەکانی ( کوردی ئەلەگەز ، بەربانگ ) و لەسالانی شەستەکاندا (قەلای دمدم)ی نوسیوە ، لەدوای عەرەبی شەمۆ چەند نوسەرێکی کوردی شۆڤێتی دەستیان کردووە بە نوسینی ڕۆمان لەوانە :

1- حاجی جوندی کە ڕۆمانەکانی (هەواری) و (بەهارهات) ی نووسیوە .

2- عەلی عەبدولڕەحمان ڕۆمانەکانی (خاتێ خانم) و (گوندی مێرخاسا)ی نووسیوە .

پ/ بۆچی بەشێکی زۆری ئەو ڕۆمانانە کاریگەرییەکی ئەوتۆیان نەبووە لەسەر ڕەوتی گەشەسەندنی ڕمان لە کوردستاندا؟

و/ چونکە تا درەنگ نەگەیشتۆتە بەشەکانی تری کوردستان ،نووسەرانی کورد لەناو بەشەکانی کوردستاندا ئەم ڕۆمانانەیان نەخوێندۆتەوە و چاویان پێی نەکەوتووە .

پ/ئەو ڕۆمانانەی کە لەناو کوردەکانی یەکێتی سۆڤێتی پێشوودا بلاوکرانەوە لەڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە چۆن بوون ؟

و/ 1- ڕۆمانەکان بە شێوەزاری کرمانجی ژوورو بە ڕێنووسی پیتی لاتینی نوسراون ، زمانی نوسینیان زۆر سادەو ڕەوانە .

2-بیروباوەڕی سیاسی ئایدۆلۆژیەتی سۆشیالیزمی سۆڤێتی پێشوو بەسەر ڕووداوەکاندا زاڵە .

3-شێوەی ڕۆمانەکان گێڕانەوەیە وەکو داستان و چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان چونکە بناغەی نوسینی ڕۆمانەکان (داستان و ئەفسانە و حەکایەتی فۆلکلۆری کوردین) دوورن لە تەکنیکی تازە و هاو چەرخ .

## قۆناغی چەسپاندن

پ/ ئەو دوو هەولە چین کەدەبن بە بناغەی بنیادی ڕۆمانی کوردی لە کوردستان ؟

و/ ئەو دوو هەولە هەردوو ڕۆمانی (پێشمەرگە)ی ڕەحیمی قازی (ژانی گەل)ی برایم ئەحمەدن.

پ/ کام لەم دوو ڕۆمانە زیاتر دەنگی دایەوە لە ئەدەبی کوردیدا ؟

و/ڕۆمانی (ژانی گەل) زیاتر دەنگی دایەوە وەك لە ڕۆمانی (پێشمەرگە) چونکە لە ڕۆژنامە وگۆڤارەکانی ئەو کاتە کۆمەلێك وتار و لێکۆلینەوەی لەسەر بلاوکرایەوە.

پ/ ڕۆمانی (پێشمەرگە) خاوەنەکەی کێیە ؟ سالی چەند و لەکوێ چاپکرا ؟ ڕۆمانەکە باسی چی دەکات ؟

و/ ڕۆمانی (پێشمەرگە) خاوەنەکەی (ڕەحیمی قازی)یە ،لەسالی (1960) لەبەغدا چاپکرا ، ڕووداوەکانی ڕۆژنامەکەش دەربارەی سەردەمی دامەزراندنی(کۆماری کوردستان)ە لە مهاباد لە سالی (1946) چونکە نووسەر خۆی بەشداری کردووە لە ڕووداوەکان و لەناوجەرگەی ڕووداوەکان بووە ، بۆیە لە خەباتی ئەو سالانەی کورد دەدوێت و ڕووداوەکان تێکەڵ بەچەند کێشەیەکی تر دەکات ، بەتایبەتی کێشەی جوتیار لەگەڵ دەرەبەگدا .

پ/ خاوەنی ڕۆمانی (ژانی گەل) کێیە ؟ سالی چەند نووسراوە و چاپکراوە ؟ بۆچی لەکاتی خۆیدا بلاونەکرایەوە ؟

و/ خاوەنی ڕۆمانی (ژانی گەل) برایم ئەحمەدە ، لە سالی 1956 دا نووسراوە و لەسالی 1972 لەبەغدا چاپکراوە ، بەلاّم لەبەرنەبوونی دەرفەتی گونجاو نەیتوانیوە لەکات و سەردەمی خۆیدا چاپی بکات .

پ/ (قەلای دمدم) ڕۆمانی کێیە ؟ بە چ دیالێکتێك نووسراوە؟ پاشان لەلایەن کێوە کراوە بە چ دیالێکتێك؟سالی چەند؟ نووسەر چۆن ڕۆمانەکەی دارشتووە ؟

و/ (قەلای دمدم) ڕۆمانی عەرەبی شەمۆیە بە دیالێکتی کرمانجی ژوورو نوسراوە ، (شوکر مستەفا) لەسالی 1976 کردوویەتی بە دیالێکتی کرمانجی خواروو کە تێیدا نووسەرەکەی (عەرەبی شەمۆ) ڕووداوی مێژوویی و بابەتی فۆلکلۆری لە شێوەی ڕۆمانێکی هاوچەرخی سەرکەوتوو دارشتووە ۔

پ/ زمانی ڕۆمانە کوردییەکانی قۆناغی چەسپاندنی ڕۆمان لەئەدەبی کوردیدا چۆن بوو؟

و/ زمانێکی تۆکمە و کوردییەکی زۆر ڕەوانە ز خوێنەر بۆ خۆی ڕادەکێشێت ۔

پ/ زمانی نووسینی ڕۆمانە کوردییەکانی قۆناغی چەسپاندن چۆن بوو ؟

و/ 1- زمانێکی تۆکمە و کوردییەکی زۆر ڕەوانە کە خوێنەر بۆ خۆی ڕادەکێشێت ۔

2- ناوەڕۆکی ئەم ڕۆمانانەسیما و شەقلی خەباتی نەتەوایەتییان پۆشیوە؟

3- ڕووداوەکان خۆمالین و لەناوجەرگەی کۆمەلی کوردەواری هەلهێنجراون۔

4- کێشەی نەتەوایەتی و خەباتی کورد بۆ سەربەخۆیی زیاتر هەستی پێدەکرێت۔

5- شێوەی نووسین زیاتر گێڕانەوەیە دوورە لە تەکنیکی هاوچەرخ هەروەها دوورە لە تەم و مژ و ئالۆزی۔

## قۆناغی گەشەکردن

پ/ قۆناغی گەشەسەندنی ڕۆمان کەی دەستپێدەکات ؟ ئەو دوو دیاردە ئاشکرایە کە دەبینرێن کامانەن؟

و/ گەشەسەندنی ڕۆمانی کوردی لەسالانی هەشتای سەدەی بیستەم دەست پێدەکات کە دوو دیاردەی ئاشکرا دەبینرێت ٪

1- ژمارەی ڕۆمانی خۆمالی نووسراو بە زمانی کوردی زیاتر دەبینرێت لە چاو قۆناغەکانی پێشوو ۔

2- ژمارەی ڕۆمانی وەرگێڕاو لە زمانی بێگانە بەشێوەیەکی بەرچاو دەبینرێت؟

پ/ ئەو ڕۆمانانە کامانەن کە لە سالانی هەشتاکاندا بلاوکرانەوە ؟ ناوی ڕۆمان و خاوەنەکانیان بنووسە ۔

و/ 1- حسێن عارف / (شار) و (ئەندێشەی مرۆڤێك)۔

2- عەزیزی مەلاڕەش / (کوێخا سێوێ) و (غەوارە)۔

3- خەسرەو جاف/ (کۆردەرە) و (هیچ)۔

4- عەبدوللا سەراج/ (هەلکشان بەرەو لوتکە).

5- دکتۆر نافیع ئاکرەیی/ (بوهژین)

پ/ لەسالآنی هەشتاکاندا و لە شاخ دوور لە سانسۆری حکومەت کۆمەلێ ڕۆمان چاپکران کامانەن ؟

و/ محەمەد موکری / (سەگوەڕ) و (تۆلە) و (هەرەس). حەمەکەریم عارف (کۆچی سوور).

پ/ ئەو ڕۆمانانە کامانەن کە لە سالآنی هەشتاکاندا لە ئەوروپا بلآوکرانەوە ؟

و/ لە ئەوروپا بە تایبەتی لە سوید ڕۆمانی (مرنا کالەکی ڕەند) و (هاوارا دیجلەیێ)کە هی (محەمەد ئۆزۆن) بوو بە دیالێکتی کرمانجی کرمانجی ژوورو بلآوکرایەوە .

پ/ چی کاری کردووەتەسەر ڕۆمان نووسین لەئەدەبی کوردی سالآنی هەشتاکاندا ؟ لەڕووی زمانەوە چۆن بووە؟

و/ دیارە ڕووداوی سیاسی و باسی خەباتی ڕەوای کورد ، ژیانی پێشمەرگایەتی نێوشاخ وداخی کوردستان ببوە هەوێنی چاوهەلهێنانی ئەم بەرهەمە تازانە ،زمانی ڕۆمانەکانیش پاراوتر و پوخت تر و چڕتر کراونەتەوە، ئەمە لەپالْ دیاردەی بایەخدان بەشێوەزاری ناوچەیی جوتیاران لەم ڕۆمانانەدا.

پ/ گەشەسەندنی ڕۆمان لەسالآنی هەشتاکاندا ڕێگەی بۆچی خۆشکرد ؟

و/ ڕێگەی بۆئەوە خۆشکرد کە ڕۆمانی کوردی لە قۆناغی نەوەدەکان زۆر زیاتر پێشبکەوێت و گەشەسەندنێکی وا بەخۆیەوە ببینێت کە هەرگیز گەشەسەندنی وای بەخۆیەوە نەبینێت .

پ/ ئەو ڕۆمانانەی سالآنی هەشتاکان لەڕووی ناوەڕۆکەوەباسیان لە چی دەکرد ؟ بایەخیان بەچی دەدا ؟

و/ باس لە کێشەی گوندنشینەکان دەکەن وەکو ڕۆمانەکانی (عەزیزی مەلا ڕەش) ، ئەگەرچی لەم قۆناغەدا شێوازی گێڕانەوە بەزۆربەی ڕۆمانەکانەوە دەبینرێت و هەست بەوەش دەکرێت کە ڕۆمان نووسەکان بایەخیان بە تەکنیکی نوێ و مۆنۆلۆج داوە و سەرکەوتوانەش بەکاریان هێناون .

پ/ ئەو ڕۆمان نووسانە کامانەن کە بەڕەچەلەك کوردن و بەزمانی بێگانە ڕۆمان دەنووسن ؟

و/ 1- یەشار کەمال بەتورکی دەنوسێت و هەندێك لە ڕۆمانەکانی کراون بەکوردی وەك (ئەفسانەی چیای ئاگرین) و (حەمەدۆك)بەچوار بەرگ و (کاریتە) ...هتد

2- سەلیم بەرەکات بەعەرەبی دەنوسێت و کوردی سوریایە وەك ڕۆمانەکانی (پەڕ) و(دلشاد) کە کراون بە کوردی .

3- ئیبراهیمی یونسی کە بەفارسی دەنوسێت و ڕۆمانی (دایکم دووجارگریا) کراوە بەکوردی و ئەم ڕۆمانە دەربارەی کارەساتی ئەنفالکردنی گەلی کوردە لەلایەن ڕژێمی بەعسی دڕندەوە .

4- عەبدول مەجید لوتفی بەزمانی عەرەبی ڕۆمانی نووسیوە وەکو ڕۆمانی (پێشبینی لێزانەفەرەجەکان) کە کراوە بەکوردی لەلایەن( شوکر مستەفا)وە.

تێبینی : ئەو ڕۆمانانەی کە بەزمانی بێگانە دەنووسرێن لەڕووی زمانەوە بەکوردی دانانرێن بەلام لەڕووی ناوەڕۆکەوە بەشێکی زۆریان باسی ژیان و خەباتی ڕەوای گەلی کورد دەکەن .

## نموونەی ئەدەب

### باباتاهیری هەمەدانی (937-1010)ز

پ/ باباتاهیری هەمەدانی ناوی بەچی دەرکرد ؟ بۆچی بەو ناوەوە بانگکراوە ؟

و/ باباتاهیری هەمەدانی ناوی تاهیر (بابا)یان پێوتووە ، چونکە یەکێك بووە لە پیاوچاکەکانی (ئەهلی هەق)ی ئاینی یارسان.

پ/ باباتاهیری هەمەدانی لەکەیدا ژیاوە ؟

و/ بەپێی سەرچاوە باوەڕپێکراوەکان لەماوەی نێوان دووەمی سەدەی دەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی یازدەیەمی زاینی ژیاوە، لەدایکبوون و کۆچی دوایی بەسالانی (937ز-1010ز) دیاری کراوە.

پ/ شیعرەکانی باباتاهیر لەڕووی ڕووخسارەوە چۆن بوون ؟

و/ شیعرەکانی باباتاهیر بەشێوەزاری (لوڕ) نووسراون ، زۆربەی شیعرەکان (دووبەیتە) کە بریتیە لە چوار نیوە دێڕ ، قافیەی نیوە دێڕی (یەکەم و دووەم و چوارەم) وەکو یەکە بەلام قافیەی نیوە دێڕی سێیەم جیاوازە ، جگە لە شیعری دووبەیت نزیکەی پێنج غەزەلیشی هەیە .

پ/ شیعرەکانی باباتاهیر لەڕووی ناوەڕۆکەوە چۆن بوون ؟

و/ لە شیعرەکانی باباتاهیردا فەلسەفەیەکی قووڵ و واتایەکی بەرز و جوان دەدرەوشێتەوە ، نمونە لەدوو بەیتەکانی باباتاهیر :

مەگەر شێر و پلنگی ئەی دڵ ئەی دڵ

بەموو دایم بەجەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ

ئەگەر دەستوم ڕەسەد خونت مەرێژوم

بوینم تا چ ڕەنگی ئەی دڵ ئەی دڵ

## مەولەوی (1806-1882)ز

پ/ بەشێك لە ژیانی مەولەوی بنووسە ؟

و/ناوی (عەبدول ڕەحیمی کوڕی سەعیدە لەهۆزی تاوەگۆزەییە ) ، لەسالی (1806)ز لەخاکی جوانڕۆ لە دێی (تاوەگۆز) لەدایك بووە، ولەسالی (1882)ز لەگوندی (سەرشاتە) کۆچی دوایی کردووە ، مەولەوی مەلایەکی یەکجار شارەزا بووە بەتایبەتی لە عەقیدە دەستێکی بالآی هەبووە ، لەسەرەتادا نازناوی(مەعدومی) ئینجا(مەولەوی) کردۆتە نازناوی خۆی.

پ/ لەڕووی ناوەڕۆکەوە شیعرەکانی مەولەوی چۆن بووە؟

و/ لەڕووی ناوەڕۆکەوە سروشتی کوردستان کاریگەری تەواوی لەسەر شیعرەکانی مەولەوی هەیە ، کە شیعری بۆ هەر چوار وەرزی ساڵ و کوێستانەکانی جافایەتی گوتووە ، لەگەڵ شیعری دلداری و ئایینی و لاوانەوە و ....هتد

پ/ مەولەوی شیعرەکانی بە چ شێوەزارێك نووسیووە ؟

و/ مەولەوی سەرجەم شیعرەکانی بە شێوەزاری (هەورامی) نووسیوە.

پ/ بەرهەمەکانی مەولەوی چین ؟		و/ 1- دیوانەکەی .		2- چەند بەرهەمێکی هەیە بەتایبەتی لەسەر (عیلمی کەلام) کە دەستێکی بالاچی هەبووە وەك (الفضیلة ، العقیدة المرضیة ، الفوائح)

3- نامیلکەیەکی بەزمانی فارسی هەیە ، کە باسی ئوسولی تەریقەتی نەقشبەندی دەکات .

ئەم پارچە شیعرەی مەولەوی دەربارەی (سروشت)ە کە تیایا وەسفی سەرچاوەی (زەلم) دەکات و دەڵێت :

وەهاران سەیرەن ، سەوزەی دیاران

نم کەوت ، نەدیدەش ، چون شەو بێداران

پەی دلەی مانیای دەروون مەلالان

سایە بەستەوە خەیمەی گۆلالان

---

## پرتەوی هەکاری (1756-1825)ز

بەشێك لەژیانی پرتەوی هەکاری بنووسە ؟

و/ ناوی (مستەفا بەگی کوڕی عەبدوللا بەگی کوڕی محەمەد کوڕی ئیزدێن شێرە) بە بنەماڵە لە میرانی ناوچەی هەکارییە ، نازناوی (پرتەوی هەکاری) یان (شاپرتەوی هەکاری) بۆخۆی داناوە ، لە ساڵی (1756)ز لە ناوچەی هەکاری لەدایك بووە و لەساڵی (1825)ز کۆچی دوایی کردووە .

پ/بۆچی ناوچەی هەکاری وەك ناوەندێکی ڕۆشنبیری دەولەمەند کاریگەری هەبووە بۆ خەملاندنی خەیالی پرتەوی هەکاری؟

و/ ناوچەی هەکاری وەك ناوەندێکی ڕۆشنبیری دەولەمەند کاریگەری هەبووە بۆ خەملاندنی خەیالی پرتەو ، چونکە ناوچەی هەکاری شوێنی لەدایك بوون و ژیانی هەندێ لە زانا و شاعیرە هەڵکەوتووەکانی وەك (عەلی تەرەماخی و عەلی حەریری و فەقی تەیران و مەلایی باتەیی و ئەحمەدی خانی) و گەلێکی تر بوون ، هەر بۆیە بە ناوەندێکی گەورەی خوێندەواری و ڕۆشنبیری دادەنرێت لە کوردستانی باکووردا.

پ/ لەڕووی ڕووخسارەوە شیعرەکانی پرتەوی هەکاری چۆن بوون ؟

و/ وەکو هەموو شاعیرە کلاسیکەکانی تری ئەدەبی کوردی ، شیعرەکانی لە ( غەزەل و قەسیدە) پێکهاتووە ، جگە لەمانەش (کۆمەلێك چوارین و پێنجین و موستەزادی) هەیە و شیعرەکانیشی بەزاری کرمانجی سەروو نوسراوە .

پ/ لەڕووی ناوەڕۆکەوە شیعرەکانی پرتەوی هەکاری چۆن بوون ؟

و/ لەڕووی ناوەڕۆکەوە (موناجات و ستایشی پەیامبەر (دروود و سەلامی خوای لەسەر بێت) و دلداری و وەسفی خۆشەویست و سروشت) ی تیادا کردووە ، وەئەمەش نمونەیەکە بە لە شیعری پرتەوی هەکاری کە بە هونەری (موستەزاد) نووسراوە :

ئیرۆکە م تایع سەحەرێ دولبەرێ سەلما

مەشیا ب خرامان

مەستانە وەش، کە چ کولەھ و قامەتی ڕەعنا

شەنگا شەبی ڕیحان

ئەڤ شیوە و ئەڤ عیشوە و ئەڤ ناز و نەزاکەت

ئەسلن م نەدی بوون

یارەب ژ هەمی دەرد و بەلا و ئافاتی دنیا

حافز کو ب یەزدان

## حەمدی (1878-1936)ز

پ/بەشێك لە ژیانی حەمدی بنووسە ؟

و/ ناوی ئەحمەدە کوڕی فەتاح بەگی حاجی ئیبراهیم بەگی مەحموودبەگی ساحیبقڕانە ، وەلەسالی(1878)ز لە شاری سلێمانی لەدایك بووە و لەشەوی (12)ی تشرینی دووەمی سالی(1936)ز کۆچی دوایی کردووە و لەگردی سەیوان لەشاری سلێمانی نێژراوە.

پ/ رووخساری شیعرەکانی حەمدی چۆن بوون؟

و/ شیعرەکانی حەمدی بەزاری کرمانجی خواروو نووسراوە وەك شاعیرێکی کلاسیکی کوردی کێشی عەروزی عەرەبی ، یەك سەروای بەکارهێناوە ، بنیاتی شیعرەکانی جگە لە غەزەل و قەسیدە، گەلێ تەرجیع بەند و تەرکیب بەند و چوارینی هەیە .

پ/ ناوەرۆکی شیعرەکانی حەمدی چۆن بوون؟

و/ لەرووی ناوەرۆکەوە شیعری (نیشتمان پەروەری و ئاینی و دلداری و وەسفی سروشتی کوردستانی) هەیە .

پ/ حەمدی شاعیر مرۆڤێکی خاوەن بیروباوەری چۆن بووە؟

و/ حەمدی خاوەن بیروباوەرێکی کوردانەی بەرز بووە ، هەربۆیە شیعرەکانی ڕاستگۆیانە لە دڵ و دەرونێکی پاکەوە هەڵقوڵاوە.

ئەمەش نمونەیەکە لە شیعری حەمدی کەلە ساڵی **1927** وتویەتی :

کوردستان

ئەی وەتەن ڕۆم و عەجەم موشتاقی کوردستانتە

ئیفتیخاری میللەتی کورد شەوکەتی عینوانتە

بەستە سەربەرزی ئێواران ،سبەینان مانگ و ڕۆژ

وەك نیشانی ئیفتیخاری سنگ و نەجمەی شانتە

## ڕەوانبێژی

پ/ ڕەوانبێژی چییە ؟

و/ ڕەوانبێژی : ئەوەیە کە قسە و هۆنراوە ڕەوان وجوان و کاریگەر بێت و لەگەڵ بارودۆخی گوێگر هەڵوێستی قسەکردنەکە بگونجێت بۆئەوەی مەبەستەکەی بەڕوونی لە خوێنەر بگەیەنێ و چێژی پێ ببەخشێت و کاری تێبکات ، ئەمەش بە هەڵبژاردنی وشەی لەبار و دارشتنی تۆکمە و ڕێکخستنی ژیربێژانە دێتەدی .

پ/ زانستی ڕەوانبێژی لەچی دەکۆڵیتەوە ؟

و/ زانستی ڕەوانبێژی لەو هونەر و دەستوور و بنەمایانە دەکۆڵێتەوە کە دەبن بە مایەی ڕەوانی و جوانی و کاریگەری قسە و پاراستنی لە لێڵی و شل و شێواوی.

# لێکچواندن

پێناسەی لێکچواندن : لێکچواندن لەسەر بنەمای بەراورد هاتووە ، بۆ ڕوونکردنەوە و چەسپاندنی سیفەتی شتێك ، ئەو شتە لەگەڵ شتێکی تر بەروارد دەکرێت کە سیفەتە مەبەستەکەی تێدا زاڵە ، بۆئەوەی سیفەتەکە بەم بەراوردە ڕوون بێتەوە و بەزێدەڕەوویی دەربکەوێت . لێکچواندن بە گشتی لە چوار بنەڕەت پێکدێت :

1- لێچوو : ئەمە بابەتی باسەکەیە و لەهەموو بنەڕەتەکانی تر لە پێشترە ، ئەوانی تر بۆ خزمەتی ئەم هاتوون.

2- لەوچوو : ئەمە بۆ ڕوونکردەوەی لایەنێکی (لێچوو) دێت کە بەراوردەکەی لەسەر بنیات دەنرێت .

تێبینی : ئەم دوو بنەڕەتە (لێچوو ، لەوچوو) بنەڕەتی بنچینەیین لە لێکچواندندا بەبێ ئەم دوو بنەڕەتە ،لێکچواندن دروست نابێت ، هەرکام لەم دوو بنەڕەتە لابدرێت لێکچواندنەکە نامێنێت .

3- ڕووی لێکچواندن : سیفەت و لایەنی هاوبەشی نێوان هەردوو بنەڕەتە بنچینەییەکەیە ، ئەم سیفەتە لە لێکچواندنی ئاساییدا لە (لێچوو) بێهێز و لە (لەوچوو)بەهێزە .

4- ئەوزار: ئەو وشەیەیە کە دەوری بەیەکەوە بەستنی هەردوو بنەڕەتی بنچینەیی لێکچواندن (لێچوو، لەوچوو) دەگێڕێ.

ئەمانە هەندێك نمونەی ئەوزاری لێکچواندنن ( وەك ، وەکو ، هەروەك ، لەودەکا ، لەو دەچێ ، ئاسا ، چون ، وێنەی ، چەشنی ، میسلی، ئەتووت ، مانەندی ...)

نمونە / دلم هەروەك سەماوەر پڕ لەجۆشە خەریکی سۆز و گریان و خرۆشە

بابەتەکە : لێکچواندنە ، هەموو بنەڕەتەکانی لێکچواندن باس کراوە .

دلم : لێچووە . سەماوەر : لەوچووە . جۆش و خرۆش : ڕووی لێکچونە. هەروەك : ئەوزارە.

نمونە / کوڕ ئاینەیێ جەماڵێ زاتن کەچ مەظهەرێ پورتەوا صیفاتن

بابەتەکە : لێکچواندنە . کوڕ: لێچووە . ئایینە: لەوچووە . جەمالی زاتن : ڕووی لێکچوونە .

تێبینی : تەنها سێ بنەڕەت باسکراوە (لێچوو،لەوچوو،ڕووی لێکچوون) بەلاَم (ئەوزار=ئامراز) نەهاتووە .

نمونە/ دەمێك بوو چاوەڕێی بەفرێکی وابووم مژدەبێ باری سەرم بەفرە کەچی هێشتا شەڕەتۆپەلمە بۆ یاری

بابەتەکە لێکچواندنە . سەرم : لێچووە . بەفر : لەوچووە .

تێبینی : لەم هۆنراوەیەدا تەنیا دوو بنەڕەتە بنچینەییەکە (لێچوو،لەوچوو) هاتوون، بەلاَم دوو بنەڕەتە نابنچینەییەکە نەهاتون (ڕووی لێکچوون و ئەوزار)

## پرسیار

1- ئەمن کێوم ، سەرم شاخە ، هەناسەکەم نەسیمە ، چاوەکانم ، مێزەرم ، تەم

بابەتەکە لێکچواندنە .

ئەمن ،سەر ، هەناسە ، مێزەر : لێچووە. کێو ، شاخە ، نەسیمە ، تەم : لەوچووە .

2- قەلبێ مە شوبهێ زێڕ ژ فەیزاتە جەلاگرت ماڕووسیەهە و سیفەت ڕەنگی سەدا گرت

بابەتەکە : لێکچواندنە . قەلبێ مە : لێچووە. زێڕ : لەوچووە . شوبهێ : ئەوزارە . جەلا: ڕووی لێکچوونە.

3- دێ بەتاو ئەشکی دوو چاوم هەروەکو دیجلەو فورات مەزرەعەی غەم سەوزە ، تێراوە لەبەرئەم دوو شتە

بابەتەکە : لێکچواندنە . ئەشك: لێچووە . دیجلەو فورات : لەوچووە . هەروەکو :ئەوزارە . تاو: ڕووی لێکچوونە.

4- تاکەی چوون مەجنوون وێڵی هەردان بم ؟ تاکەی خەمزەدەی باری هیجران بم ؟

بابەتەکە : لێکچواندنە . م(من) : لێچووە . مەجنوون : لەوچووە . چوون : ئەوزارە . وێڵی هەردان: ڕووی لێکچوونە.

5- نەیلوفەڕە دل ، تۆ دڵ ئافتابی تەن شبهی کەتان ، تۆ ماهتابی

بابەتەکە : لێکچواندنە . نەیلوفەڕ: لەوچووە . تەن : لێچووە . شبهی : ئەوزارە .

کەتان : لەوچووە . تو : لێچووە . ماهتاب : لەوچووە .

## خواستن

خواستن : ئەو لێکچواندنەیە کە تەنیا یەکێك لە دوو بنەڕەتە بنچینەکەی هاتبێ و ئەوی تر نەهاتبێ .

نموونە : ئیلاهی ! نەرگزا مەی مەست و نازك ژدەستی خوار و بەدخواهان بپارێز

بابەتەکە : خواستنی ئاشکرایە چونکە تەنها لەوچوو کە (نەرگز)ە باسکراوە ، لێچوو کە (یارەکەیەتی) باس نەکراوە .

جۆرەکانی خواستن : 1- خواستنی ئاشکرا . 2- خواستنی درکاو

1- خواستنی ئاشکرا : ئەو خواستنەیە کە لەدوو بنەڕەتە بنچینەییەکەی لێکچواندن تەنها (لەوچوو) هاتبێت و (لێچوو)نەهاتبێ

نموونە / هەرچەندە گوڵ سیس ئەبێ بگرین ئالتوونی دار ئەرژێ بگرین

بابەتەکە : خواستنی ئاشکرایە ،چونکە تەنیا (لەوچوو) کە (ئالتوونی دار) ە باسکراوە ، (لێچوو) کە (گەڵای زەردە) باس نەکراوە

لە ورشەی شەونم لە توێی پەردەوە نەرگس بەمەستی چاوی کردەوە

یار : لێچووە ، باس نەکراوە نەرگس : لەوچووە باس کراوە

**2- خواستنی درکاو : ئەو خواستنەیە کە لەدوو بنەڕەتە بنچینەییەکەی لێکچواندن تەنها (لێچوو)هاتبێ و (لەوچوو)نەهاتبێت .**

**تێبینی : خواستنی درکاو هەمیشە نیشانەیەکی لەگەلدایە وەك ( گریان ، دەست ،لێو ، پێ ، گڕ ...)**

**نمونە : تانەگریا ئاسمان و تەم ولاتی دانەگرت　　　گوڵ چەمەن ئارانەبووهەم لێوی خونچە وانەبوو**

**بابەتەکە : خواستنی درکاوە ، چونکە تەنها (لێچوو) کە (ئاسمانە) باسکراوە ، وە (مرۆڤ) کە(لەوچوو)ە باس نەکراوە .**

**وە لە نیوەدێڕی دووەمدا : (خونچە) : لێچووە باسکراوە ، مرۆڤ : لەوچووە باسنەکراوە ، (لێو) نیشانەی خواستنی درکاوە .**

**نمونە : جلەوت بابەس بەدەس هەوەس بێ　　　بەگڕی سەودا ، دڵت قەفنەس بێ**

**بابەتەکە : خواستنی درکاوە . هەوەس : لێچووە باسکراوە . مرۆڤ : لەوچووە باسنەکراوە .**

**سەودا : لێچووە باسکراوە . مرۆڤ : لەوچووە باسنەکراوە . {دەس، گڕ} نیشانەی خواستنی درکاوە .**

## پرسیار

**لەم دێڕە هۆنراوانەدا خواستن دەربهێنە و جۆرەکەی دیاری بکە :-**

**1- شێر لەبێشە دەرپەڕی دەست بەخەنجەر　　　ڕووبەڕوو ئەیدا لە زومرەی دوژمنان**

**بابەتەکە : خواستنی ئاشکرایە ، شێر : لەوچووە (باسکراوە) ، مرۆڤ : لێچووە (باسنەکراوە)**

**2- ڕۆژتە ئەی بادی نەورۆزی لەبنی بەفری گران　　　کانی پێی سربوو ، چناریش دەستی چوو ، پەنجەی تەزی**

**بابەتەکە : خواستنی درکاوە ، کانی : لێچووە (باسکراوە) ، مرۆڤ : لەوچووە (باسنەکراوە) ، پێ : نیشانەی خواستنی درکاوە**

**3- ئەو هەر دوو نیهاڵێ عەرعەرا شەنگ　　　ڕوونیشتنی میسالێ غونچە دلتەنگ**

**بابەتەکە : خواستنی ئاشکرایە ، دوو نیهال : لەوچووە (باسکراوە) بالآی یار : لێچووە (باسنەکراوە)**

**4- ئەلێن سالێك دوانزە مانگە　　　من مانگم دی چواردە سالە**

**بابەتەکە : خواستنی ئاشکرایە ، مانگ : لەوچووە (باسکراوە) ، یار : لێچووە (باسنەکراوە)**

**5- چاوەکەم ئەمڕۆ لە گولشەن گوڵ بە عیشوە خۆی نواند　　　نەك نمەك گیربم بڕوات هەبێ هیچ نەمدواند**

**بابەتەکە : خواستنی ئاشکرایە ، گوڵ : لەوچووە (باسکراوە) ، یار : لێچووە (باسنەکراوە)**

**6- تۆ بنی ماهی نەو و دەستی قەزایێ هەی هەی　　　نەزەرعێ فەلەکێ بەلکە ل عومرێ مەب داس**

**بابەتەکە : خواستنی درکاوە ، قەزا : لێچووە (باسکراوە) ، مرۆڤ: لەوچووە (باسنەکراوە) ، {دەست} نیشانەی خواستنی درکاوە**

# ڕەگەزدۆزی

ڕەگەزدۆزی : ئەوەیە کە دوو وشە یان زیاتر لە شێوەدا واتە لە دەنگەکاندا یان (پیتەکان) وەك یەك بن یان لەیەکەوە نزیك بن ، بەڵام لەواتادا جیاوازبن ، ئەگەر یەك واتایان هەبێت ئەوا ڕەگەزدۆزی دروست نابێت .

جۆرە سەرەکیەکانی ڕەگەزدۆزی :

**1-** ڕەگەزدۆزی تەواو: ئەو وشانەی کە ڕەگەزدۆزی تەواو دەیانگرێتەوە ، دەبێ لە شکلدا کت و مت و بێ جیاوازی وەکو یەك وابن ، واتە لەم خاڵانەدا وەك یەك بن : **1**- ژمارەی دەنگەکان . **2**- جۆری دەنگەکان . **3**- ڕیزی دەنگەکان .

نمونە / ئەوەی ڕێگەی لە کوردەکان گۆڕی لەعنەتی خوا لە ئەلحەد و گۆڕی

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی تەواوە / لە وشەکانی (گۆڕی ، گۆڕی) ، یەکەمیان بەواتای (گۆڕین) دێت ، دووەمیان بەواتای (قەبر) دێ .

ئەگەر خاڵت بڵێم مشکی خەتایە عەزیزم من ئەممە عەینی خەتایە

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی تەواوە ، لەوشەکانی (خەتایە،خەتایە) ، یەکەمیان بەواتای (شوێنێکە لە تورکستانی چین) ، دووەمیان بە واتای (گوناه و تاوان)دێت .

**2**- ڕەگەزدۆزی ناتەواو : ئەوەیە کە ئەو وشانەی ڕەگەزدۆزی دەیانگرێتەوە لەشکلدا کت و مت وەك یەك نەبن ، بەڵکو جیاوازییان هەبێت لەم خاڵانەدا : **1**- ژمارەی دەنگەکان . **2**- جۆری دەنگەکان . **3**- ڕیزی دەنگەکان .

نمونە / مەعشوق تویی ب فەخر و نازی عاشق تویی لێك بێ نیازی

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی ناتەواوە ، لە ژمارەی دەنگەکان لەوشەکانی (ناز ،نیاز)

تێبینی : دەنگە زیادەکە کەوتۆتە ناوەڕاستی وشەکەوە(-ی-=)

نمونە / گوڵ چوون ڕووی ئازیز نەزاکەت پۆشان وەفراوان چوون سەیل دیدەی من جۆشان

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی ناتەواوە ، لە جۆری دەنگەکان لە وشەکانی (پۆشان ، جۆشان)

تێبینی : جیاوازی لەجۆری دەنگەکان لەسەرەتا یان ناوەڕاست یان کۆتایی وشەکانە .

نمونە / یەك زێدە شیرین زیادە مەحبوب یەك ڕووحی قولووی حووری مەقلووب

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی ناتەواوە ، لە ڕیزی دەنگەکان بە وشەکانی (ڕووح) و (حوور).

ڕێزی زێڕ بەندی عەیار و کێشە هەرچەند بچوك بێ سەرنج ڕاکێشە

## پرسیار

لەم دێڕە شیعرانەی خوارەوەدا ڕەگەزدۆزی دەربێنە و جۆرەکەی بنووسە و دیاری بکە :

1- ئەی خامە تەژی گەلەك درێژ کر ئەڤ نامە بەسە تەپڕ قرێژ کر

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی ناتەواوە لەجۆری دەنگەکان لە وشەکانی (درێژکر ، قرێژکر)

2- ئێمە هەرچەندە کە قەومێکی زۆرین بەڵام چونکە قەومێکی خۆخۆرین بۆیە دائیما وا لەژێر دەستی زۆرین

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی تەواوە لە وشەکانی (زۆرین ، زۆرین) .

3- بانەچێتە لای ڕەقیبان یار ئەنیسی خانەبێ لازمە ئەو ئاسکە لەولانەبێ ، لەولانەبێ

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی تەواوە لە وشەکانی ( لەولانەبێ ، لەولانەبێ).

4- شکانیان کەمانچەی دەستم بەڵام زوو فریاکەوت هەستم

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی ناتەواوە ، لەجۆری دەنگەکان لەوشەکانی (دەستم ، هەستم) .

5- گوڵ لەناو باخا پێکەنی تا ڕۆژهەڵات گوڵ لەناو مالی منا پێی پێکەنی تاڕۆژهەڵات

بابەتەکە : ڕەگەزدۆزی تەواوە ، لەوشەکانی (ڕۆژهەڵات [ڕۆژئاوابوون]، ڕۆژهەڵات [تادەمی بەیانی])

## دژیەك

دژیەك : ئەوەیە کە دوو وشە دژ و پێچەوانەی یەکتر بن ، وەکو : گەورە و بچووك ، پاك و ناپاك ، مردن و ژیان ، بەهێز و بێ هیز...هتد

نمونە : مەژی بۆ مردن ، بمرە بۆ ژیان چۆن قازانج دەکەی تا نەکەی زیان

لەم دێڕە شیعرەدا (دژیەك) هەیە لە نێوان وشەکانی (مردن و ژیان) و (قازانج و زیان) و (ئەکەی و نەکەی)

جۆرە سەرەکیەکانی دژیەك : دژیەك دوو جۆری سەرەکی هەیە :

1- دژیەکی ئەرێ : ئەوەیە کە وشەکان هەریەکە لە ڕەگەزیکی سەربەخۆ بن ، لەماناادا دژ و پێچەوانەی یەکتر بن ، وەکو {خەندە و گریان ، تاڵ و شیرین ، سەرکەوتن و ژێرکەوتن...}

نمونە / چ ڕووناکی بێ ، چ تاریکی ، چ نزمی بێ یا بەرزی بەخۆشی بێ وەیا تالی هەمووی ئەڕوا لەسەر ئەرزی

بابەتەکە : دژیەکی ئەرێ یە بەوشەکانی (تاریکی × ڕووناکی) ، (نزمی × بەرزی) ، (خۆشی × تالی)

2- دژیەکی نەرێ : ئەوەیە دوو وشەکە بە نەفی یان نەهی بووبن بە دژیەك ، وەکو (پاك×ناپاك) ، (مەرد × نامەرد) ، (بڕۆ × مەڕۆ) ،(بەهێز × بێ هێز) .

نمونە / ئەی کوردی جەفا دیدە بەسە قەیدی ئەسارەت          نادان بەکوتەك حالی دەبێ ، دانا بە ئیشارەت

بابەتەکە : دژیەکی نەرێ یە ، لە نێوان (دانا ، نادان) کە هەردوو وشەکە لەیەك ڕەگەزن بە نەفی بونەتە دژیەك .

لە ژوانی یەکتر ناسینی لەدایك بوون و مردنما          ئەسپ سوارێکە هاتووە ، نەهاتووە

>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>>پرسیار<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<<
>>

لەم دێرە شیعرانەدا چی دژیەك هەیە دەری بێنە و جۆرەکەی دیاری بکە :

1- گەلێکم ڕۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابوارد ئاخۆ          مەرگ مەودا دەدابیینم سەردەمێکی تر

بابەتەکە : دژیەکی ئەرێیە ، لەوشەکانی (تاڵ ، شیرین)

2- ئەوەی ڕزقی موقەرەرە بۆخۆی دێ          سەد دەدفعە بخوازێ یانەخوازێ

بابەتەکە : دژیەکی نەرێیە ، لەوشەکانی (بخوازێ ، نەخوازێ)

3- یارم لە ئەندەروون هات دەستی ڕەقیب لە دەستا          غەمناك و شادمانم ، ڕەحمەت عەزابی هێنا

بابەتەکە : دژیەکی ئەرێیە لە وشەکانی (غەمناك × شادمان ) ، (ڕەحمەت × عەزاب)

4- نێرگزێن شەنگ ومەستت چەپ و ڕاست          ساقیان جام و دەستن چەپ و ڕاست

بابەتەکە : دژیەکی ئەرێیە ، لە وشەکانی (چەپ و ڕاست)

5- دژمن ل مەشانە دۆست غەمگین          مەرزە مرنا چەکۆ و تاجدین

بابەتەکە:دژیەکی ئەرێیە ، لە وشەکانی (دژمن × دۆست)

6- ئەگەر دۆستم ، ئەگەر دۆژمن بزانم          ئەوەندەم تێگەێنە کامەیانم

بابەتەکە : دژیەکی ئەرێیە ، لە وشەکانی (دۆست × دوژمن)

## جوانی بایس

جوانی بایس : ئەوەیە کە دیاردەیەك هۆی دروست و ڕاستەقینەی خۆی هەبێ ، بەڵام ئەو هۆیە بخرێتە لاوە ،بۆ جوانکردن و ڕازاندنەوەی شیعرەکە هۆیەکی تری هونەرمەندانەی بۆ دروست بکرێ  کە زۆر دوور بێت لە هۆیە دروست و ڕاستەقینەکەی خۆی .

نمونە /

مانگی نەو بۆیە هەموو شەو زیاد ئەکا و ئەشنێتەوە          تاجوانی خۆی وەکو ڕووی تۆ بڕازێنێتەوە

کاتێ گەییە چواردەمین شەو تێ ئەگا ناگا بەڕووت      جا لەداخا ورده ورده کز ئەبێ و ئەتوێتەوە

بابەتەکە : جوانی بایسە ، چونکە شاعیر هۆی دروست و ڕاستەقینەی خستۆتە لاوە ، بۆجوانی هۆیەکی هونەرمەندانەی دروست کردووە .

نمونە/ نیگار شین پۆشە بۆیە ئاسمانیش      هەمیشە ڕەنگی شینە وادەکا شین

بابەتەکە : جوانی بایسە ، چونکە شاعیر هۆی دروست و ڕاستەقینەی خستۆتە لاوە ، بۆجوانی هۆیەکی هونەرمەندانەی دروست کردووە .

ــــــــــــــــ پرسیار ــــــــــــــــ

لەم دێڕە شیعرانەدا جوانی بایس دەربێنە و دیاردەکە دەست نیشان بکە و هۆیە جوان دروست کراوەکە ڕوون بکەوە :

1= لەخەوفی تەلعەتی ، ڕۆژ هەروەکو شێت      بەڕوو زەردی هەلات و کەوتە کێوان

بابەتەکە : جوانی بایسە ، چونکە شاعیر هۆی دروست و ڕاستەقینەی خستۆتە لاوە ، بۆجوانی هۆیەکی هونەرمەندانەی دروست کردووە .

2= شەماڵ لە ترسی شنەی نسێی سەخت      پەنای بۆ باسك و پێدەشت هێناوە

بابەتەکە : جوانی بایسە ، چونکە شاعیر هۆی دروست و ڕاستەقینەی خستۆتە لاوە ، بۆجوانی هۆیەکی هونەرمەندانەی دروست کردووە .

3= نارنج و تورنج شوبهی زینێ      زەرد بویێ ل عیللەتا ئەڤینێ

بابەتەکە : جوانی بایسە ، چونکە شاعیر هۆی دروست و ڕاستەقینەی خستۆتە لاوە ، بۆجوانی هۆیەکی هونەرمەندانەی دروست کردووە .

4= لە لێواری حەوزا گوڵاڵە و بەیبوون      ساوان ، ئەلەرزن ، لەتاو نقووم بون

بابەتەکە : جوانی بایسە ، چونکە شاعیر هۆی دروست و ڕاستەقینەی خستۆتە لاوە ، بۆجوانی هۆیەکی هونەرمەندانەی دروست کردووە .

5= پەڵەی گوڵاڵە لەترسی چنوور      ناوجەرگی سووتاو ڕەش هەڵگەڕاوە

بابەتەکە : جوانی بایسە ، چونکە شاعیر هۆی دروست و ڕاستەقینەی خستۆتە لاوە ، بۆجوانی هۆیەکی هونەرمەندانەی دروست کردووە .

6= خوێنی پاکی لاوی کوردانە ڕژاوە کێو و کەژ      بۆیە وا ئێستاکە سوورە ، ڕەنگی گوڵناری هەیە!!

بابەتەکە ؛ جوانی بایسە ، چونکە شاعیر هۆی دروست و ڕ استەقینەی خستۆتە لاوە ، بۆجوانی هۆیەکی هونەرمەندانەی دروست کردووە .

## تێهەڵکێش

تێهەڵکێش ؛ ئەوەیە شاعیر یان نووسەر ، نیو دێڕ ، یان دێڕێك یان سەراپای هۆنراوەیەك ، یان پەندێك ، یان ئایەتێك ، یان فەرموودەیەك یان قسەیەکی نەستەق بێ دەستکاری وەربگرێت و لەناو دوو کەوانە بیخاتە ناو بەرهەمەکەی خۆیەوە ، جاناوی خاوەنەکەی ببات یان نەبات .

نموونە / خودا دەڵی لە قورئان ؛ ﴿الطلاق مرتان فإمساك بمعروف أو تسريح بإحسان﴾

بابەتەکە ؛ تێهەڵکێشە ، چونکە شاعیر ئایەتیکی قورئانی پیرۆزی تێکەڵ بە شیعرەکەی کردووە .

نموونە / دەمێ کۆچبارەکەت ناچێ لەیادم دەبێ وەك کوشتمت بشپرسی دادم

﴿﴿کەبارگەکەت بۆ هەوار تێك نا عەزیزم شکا ئەستوندەگی تاولی مرادم﴾﴾

بابەتەکە ؛ تیهەلکێشە ، چونکە ﴿هەژاری﴾ شاعیر ، دێڕە شیعرێکی ﴿هێمن﴾ی شاعیری تیهەلکێشی شیعرەکەی کردووە .

نموونە / بۆچی فەرمویەتی نەبیی ئەمین ﴿درودی خوای لەسەر بێت﴾

﴿﴿اطلبوا العلم ولو بالصين﴾﴾ ﴿ئەم فەرمودەیە هەڵبەستراوە﴾

بابەتەکە ؛ تێهەڵکێشە ، چونکە شاعیر ﴿حاجی﴾ فەرمودەیەکی تێهەڵکێش کردووە بە شیعرەکەی .

پرسیار

لەم دێڕە شیعرانەدا تێهەڵکێش دەربهێنە لەگەڵ ئاماژە بە بابەتە تێهەڵکێشکراوەکە .

1- قەدری میللەتتان بەجارێ شکان
نەحەیاتان ما ، نەناو و نیشان
باری تەعنەتان واهاتە سەرشان
﴿وەفدی کوردستان، میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان﴾

بابەتەکە ؛ تێهەڵکێشە چونکە شاعیر دێڕە هۆنراوە وەرگیراوەکەی خستۆتە نێوان دوو کەوانەکەوە .

2- گوڵ لەسەر لقی خۆیا ڕەنگینە ﴿بەردیش لەجێی خۆی سەنگینە﴾

بابەتەکە ؛ تێهەڵکێشە ، چونکە شاعیر پەندێکی پێشینانی خستۆتە نێوان دووکەوانەوە .

3- ڕۆژێ فەرموویت ﴿ليس للإنسان الا ما سعى﴾ هیچ کەسیش هێزی فەلاح ئیش کێڵانی نییە

بابەتەکە ؛ تێهەلکێشە ، چونکە شاعیر ئایەتێکی خستۆتە نێوان دوو کەوانەوە .

4- لە دوو ئاوان کە یەکدەگرێ دوو میسرەعی بەیتی مەولەوی

(سیروانی ئەم چەم تانجەرۆی ئەو چەم بدەن بەیەکدا ئەم چەم بۆ ئەو چەم)

بابەتەکە ؛ تێهەلکێشە ، چونکە دێڕی دووەم کە خراوەتە نێوان دوو کەوانەوە بەرهەمی شاعیرێکی ترە .

5- سەیری کە ئەڵێی خوێنی ڕژاوی گەشی تۆیە (سیروانی سروشکم کە ئەکا هاژە لەسەردا)

بابەتەکە ؛ تێهەلکێشە ، چونکە لە نیوەدێڕی دووەم کە خراوەتە نێوان دوو کەوانەوە بەرهەمی شاعیرێکی ترە.

6- تانەتناسی ئایەت و سەعاتی ئەوقاتی دوعا فائیدەی چی (ربنا أنزل علينا مائدە)

بابەتەکە ؛ تێهەلکێشە ، چونکە لە نیوەدێڕی دووەم ئایەتێکی تێهەلکێش کردووە .

تێبینی ؛ هەموو پێنج خشتەکیەکانی شاعیرێك لەسەر شیعری شاعیرێکی تری دەکا بەر هونەری تێهەلکێش دەکەوێت .

ئامادەکردنی : م . تاهیر مەحمود کاکە حەمە

2015-2014




ئاهـ خوێندەوارییـە ، لای مـن هـەر بـە خویندەوارییـە

هـەر میللەتێـك خوێندنـی نەیێـت دەردی کارییـە

ئاهـ خۆزگـە خوێندنیـش وەکـو مـن ئارەزوو ئەکـەم

بیبینـم و نەیێتـە گرێـی قورسـی کفنەکـەم

پیرەمێرد


